# ماکیاڤیللی
# و
# بیری ڕێنسانس


**نووسینی: رامین جەهانبەگلو**

**وەرگێڕانی: موسڵح ئیروانی**


**چاپی دووەم**






سەرچاوەی فارسیی ئەم وەرگێڕانە:

رامین جهانبگلو
ماکیاولی و اندیشهء رنسانس
نشر مرکز، چاپ دوم
تهران ١٣٧٨

**ناوی کتێب: ماکیاڤیللی و بیری ڕێنسانس**

– نووسینی: رامین جەهانبەگلو

وەرگێڕانی: موسڵح ئیروانی

– نەخشەسازی ناوەوە: موسڵح ئیروانی

– بەرگ: ئاسۆ مامزادە

– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

– ژمارەی سپاردن: ٨٧٤

– تیراژ: ١٠٠٠ دانە

– چاپی یەکەم ٢٠٠١

– چاپی دووەم ٢٠٠٦

– نرخ: ١٥٠٠ دینار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب (١٩٤)



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**www.mukiryani.com**
**asokareem@ maktoob.com**
**Tel: 2260311**

# پێڕست

پێشکەش بە دایکم خوجەستە کیا

نووسەر

(پێشکەش بە رۆحی عەبدولقەهاری باوکم،

کە بووە قوربانیی دڕندەترین رژێمی سیاسی)

وەرگێڕ

## پێشەکیی وەرگێڕ

میر پێویستی بە خۆشەویستی و متمانەی خەڵکە بۆ ئەوەی بتوانێت دژی مەترسی و دوژمنایەتییەکان بوەستێتەوە، لە کاتێکدا ئەگەر پشت بە دەسەڵاتداران ببەستێ ئەوا نەک تەنیا لە بەرانبەر تەنگوچەڵەمەکاندا بە تەنیا جێی دەهێڵن، بەڵکو ناتوانێت خۆشەویستیی خەڵک وەدەست بێنێت.

*ماکیاڤیللی*

ئەم نامیلکەیەی بەردەستتان، سەرەتا بە زمانی فەرەنسی لە ساڵی ١٩٨٥دا بڵاوکراوەتەوە. بەڵام وەک نووسەرەکەی ئاماژەی بۆ کردووە، هەشت ساڵ دوای چاپە فەرەنسییەکە، ئەوجا دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخساوە کە، سەرەڕای هێشتنەوەی بیرۆکەی سەرەکیی کتێبەکە وەک خۆی، سەرلەنوێ پێیدا بچێتەوە و بەشێوەیەکی وردتر دایبڕێژێتەوە.

بە پێویستم نەزانی لەم پێشەکییەدا باسی ناوەڕۆکی ئەم کتێبەتان بۆ بکەم، ئەوەی پەیوەندی بە ناوەڕۆکی کتێبەکەوە هەیە بۆ



خوێنەرانی جێ دەهێڵم. تەنیا ئەوەندە نەبێ هەوڵدەدەم ئەو شتانەی کە هەست دەکەم لەم کتێبەدا باس نەکراون، ئاماژەیەکیان بۆ بکەم.

نیکۆلۆ ماکیاڤیللی (Nicollo Machiavelli) هزرڤان و سیاسەتوانی ناوداری ئیتاڵی، لە ٣ی مایسی ساڵی ١٤٦٩دا لە شاری فلۆرەنسا لەدایکبووە و لە ٢٢ی حوزەیرانی ساڵی ١٥٢٧دا کۆچی دوایی کردووە. باوکی خاوەن بیروڕای هیومانیستی (انسانی) بووە و لە پانتایی سیاسیدا خاوەن نفووز بووە. ئەم کەشوهەوا خێزانییەی ماکیاڤیللی وای لێکرد لە تەمەنی ٢٩ ساڵیدا بگاتە پلەوپایەیەکی گرنگی کارگێڕی لە فلۆرەنسادا. دواتر بەهۆی ئەو وەزیفە و فەرمانە کارگێڕییانەی پێی سپێردرابوون وەک باڵیۆزی فلۆرەنسا، زۆر کاری ئەنجامدا. بەهۆی ئەمانەوە بیروڕا و بۆچوونەکانی لەمەڕ سروشتی ئادەمیزاد و چۆنیەتی وەدەستهێنانی دەسەڵات و کۆنترۆڵکردنی، چەکەرەیان کرد.

ماکیاڤیللی لە ساڵی ١٥١٣دا کتێبێک دەنووسێت بە ناوی **میر** (The Prince) کە هەر بەم بەرهەمە ناوی دەرکردووە، بەرادەیەک هەر کە ناوی ماکیاڤیللی بەسەر زماناندا دێت، ناوی **میری** بەدوادادێت. لەم کتێبەدا، بە رادەیەکی زۆر کاریگەریی دەسەڵاتداران و میران بەسەر ماکیاڤیللییەوە دیارە، تا ئەو رادەیەی کە کتێبەکە پێشکەش بە بنەماڵەی مەدیچییەکان دەکات. کتێبی **میر** لە (٢٦) بەش پێکهاتووە کە تێیدا جەخت لەسەر «پاشایەتی» کراوەتەوە وەک سیستمێکی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی کۆمەڵگای سیاسی. بنیتۆ مۆسۆلینی لە ساڵی ١٩٢٤دا چەند تێبینییەکی لەسەر کتێبی **میر** نووسیوە، و باس لەوە دەکات کە دوای تێپەڕینی چوار سەدە بەسەر نووسینی میردا،

ئایا هیچ شتێکی نوێ و بەکەڵکی بۆ سیاسەتمەداری هاوچەرخ تێدایە؟ ئەو پێی وایە ڕێبازی ماکیاڤیللی دوای ئەو هەموو ماوەیە، هێشتا هەر زیندووە. لەم وتەیەی مۆسۆلینی ئەوەمان دەست دەکەوێ کە ماکیاڤیللی لە میر دا ڕۆحی تاکەکەس و میللەتان دەدوێنێ نەک ڕواڵەتی دەرەوەی ژیانیان. لەبەر ئەوەی، بەڕای ئەو، ڕۆحی مرۆڤ لەو ماوەیەدا بە نیمچە نەگۆڕی ماوەتەوە، هەر بۆیە کتێبی **میر** بایەخی خۆی لەدەست نەداوە.

ماکیاڤیللی لە کتێبی میر دا هەوڵێکی زۆر دەدات "ئەخلاقی گشتی" (General Morality) لە "ئەخلاقی دەوڵەت" (Morality of state) جیا بکاتەوە. هەر بۆیە لە لێکۆڵینەوەکەیدا باس لە "ئەخلاقی دەوڵەت" یان بە دەستەواژەیەکی دیکە، باس لە ئەخلاقی سیاسی دەکات. ئەمەش گەورەترین دەستکەوتە لە مێژووی فەلسەفە و بیری سیاسیی نوێدا. ماکیاڤیللی لەڕێی داماڵینی سیاسەت لە ئەخلاقی گشتی، جۆرە ئەخلاقێکی دیکە بۆ سیاسەت دیاری دەکات. لە ڕاستیدا دەبێ بڵێین جۆرە ئەخلاقێکی دیکە کەشف دەکات و پەردەی لەسەر لادەدات. "بێ ئەخلاقییەتی" سیاسەتی ماکیاڤیللی، جۆرە ئەخلاقێکە، بەڵام ئەخلاقێکی تایبەت بە سیاسەت. بەڕای ئەو، ئەخلاقی سیاسی، بەشێوەیەکی گشتی، ئەو شتانە دەگرێتەوە کە بۆ پاراستنی دەوڵەت و بەردەوامبوونی زەروورن. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە سیاسەت بواری "شتەحەڵاڵەکان"ە. بەپێی بۆچوونی ماکیاڤیللی؛ سیاسەت سیمایەکی نائەخلاقیی هەیە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سیاسەت ماهیەتێکی ناموقەددەسی هەیە، و بەپێی تێگەیشتنی ئەو بۆ سیاسەت کە تێگەیشتنێکی سێکولاریستیانەیە، پێی وایە هەموو



کارێکی ڕێگەپێدراو و مەشرووع دەگرێتەوە بۆ دابینکردنی هەلومەرجێکی لەبار بۆ دامەزراندن و پتەوکردنی دەوڵەت، هەر بۆیە سیاسەت لە گشت ڕەهەندێکی پیرۆز (مقدس) دادەماڵێت. ئەمەش لەبەر ئەوەی کە لەناو سیاسەتدا هەموو کارێک «ڕێگەپێدراو» و «حەڵاڵ»ە. بەڵام لە مەسەلە پیرۆزەکاندا، زۆر کاروباری ناشەرعی و ڕێگەپێنەدراو هەن. بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی یەکگرتوو تەوەرێکی سەرەکیی گشت بیری سیاسیی ماکیاڤیللی و تەنانەت هەوڵە سیاسییەکانیشی پێکدێنێت. خواست و ئاواتی هەرە گەورەشی هەر لەم بیرۆکەیەدا دەدۆزینەوە -*ئاواتی دامەزراندنی دەوڵەتی یەکگرتووی ئیتاڵیا*.

ماکیاڤیللی جەوهەری قوڕین و شەیتانیی مرۆڤی کەشف کردووە و بیروڕا سیاسییەکانیشی هەر لەسەر ئەم جەوهەرە بەدەی مرۆڤ بنیات ناوە. هۆی ئەوەی کە ماکیاڤیللی بە شەیتان ناوزەدکراوە و بیروڕاکانیشی بە وەسوەسە دروستکەر لە دڵی خەڵکدا لەبەر ئەوەیە کە لە ناو ناخی مرۆڤ و خواست و ئارەزووەکانیدا شەیتان و خۆپەرستی و بەرژەوەندیخوازیی یەکلایەنە ئامادەییان هەیە.

ماکیاڤیللی تا ڕادەیەکی زۆر لە بیرمەندە سیاسییەکانی دیکە ڕاستگۆتر بووە. دەشێ ئەو وەسفە بەد و خراپانەی دراونەتەپاڵی بەهۆی ئەوەوە بووبێ کە قسەکانی حەق و کەواتە ڕەق بوونە. زۆر لەسەر ماکیاڤیللی گوتراوە، بەڵام گشتی لە ڕوانگەی ڕواڵەتیانەی ئەو بیروڕایانەی لە کتێبی **میر** دا باسکراون. ئەوەی ئەم نامیلکەیە جیادەکاتەوە ئەوەیە کە داکۆکییەکی زێتر دەکاتە سەر کتێبی دووەم و فرەوانتری ماکیاڤیللی، واتە «گوتارەکان».

ماکیاڤیللی یەکەم بیریاری سیاسییە کە سیاسەتی مۆدێرن لە بەرانبەر و دژ بە نەریتی ئەخلاقیی مەسیحیی ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست دادەڕێژێت. بەدەستەواژەیەکی دیکە، ماکیاڤیللی دامەزرێنەری بیری سیاسیی مۆدێرنە کە بۆ یەکەمجار لە سەردەمی رێنسانسدا باس لە مەسەلەی قەیرانی ناسنامەی سیاسی دەکات و هەوڵدەدات لە رێی دامەزراندن و داڕشتنی چەمکێکی نوێ بۆ سیاسەت، لە نەریتی سیاسیی سەردەمی خۆی دوور بکەوێتەوە. هەر بۆیە هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر پێمان وابێ ماکیاڤیللی پسپۆڕێکی تەکنیکییە، چونکە ئامانجی ماکیاڤیللی رێکخستنی واقعی کۆمەڵایەتییە لە رێی دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێزەوە. بەڵام باشترین دەوڵەت لای ئەو کۆمارییە، چونکە بەڕای ئەو کۆمار تاکە رێکخستنێکی سیاسییە کە بیر و رەفتاری راستەقینەی هاووڵاتیان پەروەردە دەکات. لەوانەیە باشترین خزمەتی ماکیاڤیللی بۆ فەلسەفەی سیاسیی نوێ بریتی بێت لە هێنانەکایەی کەشوهەوایەکی رەخنەگرانە کە بەسستکردن و لەرزاندنی بناغەی وەحدانییەتی ئایینی سەدەکانی ناوەڕاست باسی هۆشیارییەکی مێژوویی دەخاتەڕوو کە لەڕووی فەلسەفییەوە هیگڵ دایمەزراندووە.

ماکیاڤیللی پیاوی سەردەمی خۆی و بەرهەمی واقعی ئەوسای خۆی بوو. بەرهەمی واقعی ئەوسای ئیتاڵیا و رۆشنکەرەوەی رێنسانس بوو. لە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا و لە دەمی سەرهەڵدانی بزاڤی ریفۆرمیستیدا لە ئەوروپا، "پاشایەتی" رووبەڕووی سێ رکابەر ببووەوە: کڵێسا و دەسەڵاتی دەرەبەگەکان و بزاڤە توندڕەوە ئایینی و جەماوەرییەکان. بەڵام بەهۆی ململانێ و



تێکبەربوونی تایفە ئایینەکان کە ئاژاوەیەکی گەورەی نابووەوە و جەماوەری ماندووکردبوو، و هەموویان چاوەڕێی رژێمێکی بەهێز و دەسەڵاتدار بوون کە رۆڵێکی مەرکەزی لە کۆمەڵگادا بگێڕێت و ئاسایش بۆ خەڵک دابین بکات. لەو حاڵەتەدا، پاشایەتی گونجاوترین پشتوپەنا بوو کە هەم رۆشنبیران و هەم چاکسازیخوازان (ریفۆرمیست)ی میانەڕەو پشتیوانیان لێ دەکرد، بەتایبەت چینی روو لە زیادبووی شارنشینی (بۆرژوا)ش بە پشتیوانیی پاشایەتی دەیتوانی هەردوو رکابەری خۆی، واتە کڵێسا و فیۆدالیزم، لە گۆڕەپان وەدەرنێت. بەم شێوەیە ئەستێرەی بەختی پاشایەتیی موتڵەق درەوشایەوە بۆ ئەوەی لە بەردەم تێڕوانین و چاوەڕوانیی خەڵکی ئەوروپادا رێگەیەک رووناک بکاتەوە کە کۆتاییەکەی بە "لیبرالیزم" دەهات.

لەو هەلومەرجەدا ماکیاڤیللی توانی لە گۆڕەپانی سیاسەتدا ببێتە قسەکەری راستەقینەی سەربژاردە نائایینییەکان و بەڕاستی دەتوانین ماکیاڤیللی بە نوێنەری رەوتی "رێنسانس" لە بواری سیاسەتدا دابنێین.

ئیتاڵیا- خاڵی دەستپێک و گرنگترین شوێنی رێنسانس- لەسەردەمی ماکیاڤیللیدا بە بارودۆخێکی زۆر ناهەموار و ئاڵۆزدا تێدەپەڕی. لە سەردەمی ئەودا، ئیتاڵیا لە پێنج حکوومەتی جیاواز پێکهاتبوو: پاشایەتی ناپۆلی لە باشوور، میرنشینی میلانۆ لە باشووری رۆژئاوا، کۆماری ئەرستۆکراتی (اشرافی) لە باکووری رۆژهەڵات، کۆماری فلۆرەنسا، دەوڵەتی پاپاش لە ناوەند. ئەم دابەشبوونەی وڵات لە نێوان زۆرداران و نەبوونی دەسەڵاتێکی یەکخەر، خەڵکی ئیتاڵیای رووبەڕووی جۆرەها مەینەتی کردبووەوە و

بەردەوام لەلایەن فەرەنسی و ئیسپانی و ئەڵمانییەکانەوە هێرشیان دەکرایە سەر. تەنیا بە لەبەر چاوگرتنی ئەم بارودۆخە دەتوانین بە دروستی لە بیروڕا و تێزەکانی ماکیاڤیللی تێبگەین.

ماکیاڤیللی میتۆدێکی تایبەت بە خۆی هەیە کە لە کتێبەکانیدا رەنگی داوەتەوە، ئەویش میتۆدی ئیستقرایە (Induction). ئەو بەپێی ئەم میتۆدە لە دیاردە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان دەکۆڵێتەوە. ماکیاڤیللی ماوەیەکی باش بە مێژووەوە خەریک بووە، ئەمەش لە گشت بەرهەمەکانیدا رەنگی داوەتەوە. ئەو هەوڵدەدات لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی مێژووی ئادەمیزاد و رووداوەکانی رابردوو بکات. لەم نێوانەشدا بەدوای هۆکارەکاندا دەگەڕێ و ئەو ئەنجامانەی لێی دەکەوێتەوە دەستنیشان دەکات. لەهەمان کاتیشدا، دوای کێشانی وێنەی رابردوو، هەڵدەستێ بە بەراوردکردنی ئێستا و رابردوو لەو رووداوانەی مێژوودا کە لێکدەچن. ئەمەش بۆ هەڵێنجانی ئەنجامگەلێک و دۆزینەوەی قانوونەکانی سیاسەت. هەروەها لێکۆڵینەوە لە رووداوەکانی رابردوو لەوانەیە یارمەتیان بدات بۆ دەستنیشانکردنی هەندێ یاسا کە بارودۆخێکی تایبەت لە سیستمێکدا دەخوڵقێنن. لەهەمان کاتیشدا بە پشتبەستن بەم قانوونانەوە، ماکیاڤیللی واقعی ئێستای خۆی دەخوێنێتەوە و پێشبینی رووداوەکانی داهاتوو و ئەو ئەنجامانە دەکات کە لە رووداوەکانی ئێستاوە دەکەوتەوە.

موسڵح ئیروانی
زستانی - ٢٠٠١



**سەرچاوەکان**

(١) نیقولو میکیافیللی، الامیر، تعریب: خیری حماد، منشورات مکتبة التحریر، بغداد، الطبعة التاسعة، ١٩٨٨.

(٢) لئو شتراوش، فلسفه سیاسی چیست؟، ت: د. فرهنگ رجایی، انتشارات علمی و فرهنگی، چاپ اول، تهران، ١٣٧٣.

(٣) سید محمد خاتمی، از دنیای شهر تا شهر دنیا: سیری در اندیشه سیاسی غرب، نشرنی، چاپ ششم، تهران ١٣٧٧.

(٤) د. حمید عضدانلو، شهریار و شهریار مدرن: مطالعەای تطبیقی درباره عقاید ماکیاولی و گرامشی، ماهنامه اطلاعات سیاسی- اقتصادی، ش: ٩٣-٩٤، سال نهم ١٣٧٤، ص ١٩-٢٤.

## پێشگوتە

"ماوەیەکە هەر مێژوونووسێکی بەرهەمەکانی ماکیاڤێللی دەیگری، چ بیەوێ و چ نەیەوێ دەبێتە مێژوونووسی ماکیاڤێللیزم"

ریمۆن ئارۆن

## ماکیاڤێللی و ماکیاڤێللیزم



لە ساڵی ١٧٨٧، ٢٥٠ ساڵ دوای مردنی ماکیاڤێللی، دۆکی گەورەی توسکانا- لە پاڵ گۆڕی پیاوە ناودارەکانی وەک دانتێ، گالیلۆ گالیلێ و مایکل ئەنجیلۆ- خانووێکی بۆ ڕێزلێنان لە ماکیاڤێللی دروستکرد. لەسەر ئەو خانووە ئەم رستە لاتینییەی خوارەوە نووسراوە:

TANTO NOMINI NULLUMPAR ELOGIUM

(هیچ وشەیەک بۆ ستایشکردنی خاوەنی ئەم ناوە بەس نییە)

تێپەڕبوونی٢٥٠ ساڵ پێویست بوو بۆ ئەوەی ماکیاڤێللی بە ئەندازەی بلیمەتایەتی خۆی ڕێزی لێ بگیرێت. لە راستیدا ماوەیەکی دوور و درێژ بوو، ناوی ماکیاڤێللی نیشانەی دەسەڵاتێکی "خراپ" دەگەیاند. ماکیاڤێللی نووسەرێکە لە ژیاندا نەفرەتیان لێدە کرد و دوای مردنیشی ریجیناڵد پۆل، ئەسقۆفی کانتربۆری، ئەوی- بە هۆی ئەو بوێرییەی لە نووسینی کتێبی **میر** دا هەیبوو- لەگەڵ شەیتاندا بەراورد دەکرد. تەنانەت دەڵێن لە کۆتایی سەدەی شازدەدا یەسوعییەکانی "باویر" داوایان کردبوو بۆ رزگارکردنی دونیا لە وەسوەسەی بیروڕاکانی ماکیاڤێللی، وێنەکەی بسووتێنن. بەڵام ئایا بەرهەمەکانی ماکیاڤێللی، بۆ ئەوانەی کە لە دوای ئەودا هاتوون بەو رادەیە وەسوەسەئەنگێز بوون کە پاشایەکی- وەک فریدریش پرۆسی- ناچار بێت کتێبێک بە ناوی "دژی ماکیاڤێللی" بنووسێت؟

له کەس شاراوە نییە کە بەرهەمەکانی ماکیاڤیللی چەندین سەدە لە سەرانسەری جیهاندا، کێشە و هەرایەکی گەورەیان نایەوە. ئێستاش، هەر کە ناوی ئەومان بەسەر زماندا دێت، باس و گفتوگۆی توند سەبارەت بە ئەنجامە ئەخلاقییەکانی بەرهەمەکانی ئەو دروست دەبن. بەڵام بە چاوپۆشی لە هەر بەهایەکی ئەخلاقی کە ئەمڕۆ بە نووسینەکانی دەدرێت، بەها و نرخی ئەو بیروڕایانەی کە تێیدا هاتوون بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار گۆڕانیان بەسەردا نەهاتووە. کەواتە بۆچی بترسێین لەوەی کە ماکیاڤیللی بە "ناپاک و تاوانبار" لە قەڵەم بدرێت. ئەوەی بەدڵنیاییەوە دەکرێ لەبارەی ئەوەوە بگوترێ ئەوەیە کە بەرهەمەکانی ئەو یەکێکن لە گەورەترین بنەماکانی بیری سیاسی چونکە ماکیاڤیللی لەو یەکەمانەیە کە بیری سیاسیی نوێی بنیاتناوە. بابەتی ئەم بیرە ئەوەیە کە باس لە مەسەلەی بنیاتنانی سیستمی سیاسی لەسەر بنچینەی "دەسەڵاتی دەوڵەت" دەکات و چوارچێوەیەکی پێویست بۆ فۆرمۆلەبەندیی مەسەلەی سیاسەت –وەک کایەی پیادەکردنی دەسەڵات– بەدەستەوە دەدات. بەدەستەواژەیەکی دیکە، بەڕای ئەو، بۆ "دامەزراندنی شەرعییەتی دەوڵەت"، پیادەکردنی دەسەڵات لەلایەن سیاسەتوانەوە پێویستە؛ بەم شێوەیە، ماکیاڤیللی، وەڵامێکی کردەنی بۆ "مەسەلەی دامەزراندنی دەوڵەت" دەداتەوە. کەواتە، دەوڵەت، وەک دەزگا و بنکەی پیادەکردنی دەسەڵات، پێش هەموو شتێک، پانتاییەکە بۆ چالاکییەکانی ئەو کەسەی دەسەڵاتی وەدەست هێناوە و هەوڵدەدات بیپارێزێت. بەگوتەیەکی دیکە، بەڕای



ماکیاڤیللی، مەسەلەی سیاسەت، مەسەلەی هاتنەکایەوەی سیستمێک بۆ بەڕێوەبردنی [کاروباری]* مرۆڤەکانی لێ دەکەوێتەوە. هەر بۆیە پێویستە بڵێین بیری ماکیاڤیللی، بە لەبەرچاوگرتنی گشت لایەنەکانی، ئەم خاڵە روون دەکاتەوە کە: سیاسەتوان، پێش سیاسەت دەکەوێت و "تایبەت" لە پێش "گشتی" یەوەیە.

کەواتە، بەڕای ماکیاڤیللی، پێویستە سیاسەت زێتر بە مەیدانێک بۆ چالاکیی سیاسەتوان لەقەڵەم بدەین نەک کایەیەک بۆ دامەزراندنی "دامەزراوێکی کۆمەڵایەتی" بەشێوەیەکی عەقڵانی. ئەم دوالیزمە واقعییەی نێوان "میری بەدیهێنەری دەوڵەت" و "دەوڵەتێک کە ئەو دایهێناوە"، لە وابەستەیی "فەرمانڕەوایی دەوڵەت" بە کەسی میرەوە، دەردەکەوێت. کەواتە دەتوانین بڵێین بەڕای ئێمە، سیستەمی سیاسی، دروستکراوی ئەو گەورە پیاوانەیە کە توانیویانە – بەپێی زەروورەت– دەوڵەتێک بهێننەکایەوە. ماکیاڤیللی، لەنێوان گەورە پیاواندا، ناوی کەسانی وەک موسا، کوروش، ڕۆمۆلۆس و تێسۆسی دەبرد؛ بەڵام دەڵێت ئەوانە "ئەگەر چەکدار نەبوونایە هەر لە زووەوە نەیاندەتوانی دامەزراوەکانی خۆیان بەرێزەوە بپارێزن".[1] چونکە سەرکەوتنی سیاسیی هەر دامەزرێنەرێکی دەوڵەت و هەر قانووندانەرێک، لە سەرکەوتنە سەربازییەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت. "هەر لەبەر ئەوەیە هەموو پێغەمبەرە چەکدارەکان سەرکەوتوو بوونە و پێغەمبەرانی بێ چەکیش نووشستیان هێناوە".[2]

---

* نووسینی ناو ئەم جۆرە کەوانانە هی وەرگێڕە –م. ئـ

لەو رووەوە، هەلومەرجی هاوسەنگ و مانەوەی هەر سیاسەتێک لە جەنگدا دەستەبەر دەبێت. کاتێک کە چەکی فرت و فێڵ ئیتر بەکارنەیەت پێویستە سیاسەتوان پشت بە هێزە واقعییەکانی خۆی ببەستێت. بەڵام نابێت لە یادمان بچێت کە "بۆ پەڕینەوە لە ئاستی لاوازی بۆ ئاستی هێز و گەورەیی"[3]، جاروبار لایەنی شاراوەی فێڵ، لەلایەنی ئاشکرای هێز و پیادەکردنی دەسەڵات، زێتر بەکەڵک دێت. زەروورەتی پیادەکردنی هێز، ئەوکاتە دەردەکەوێت کە مەسەلەی پاراستنی بارودۆخی سیاسی، لە گۆڕینی ئەم بارودۆخە زێتر جێی باس بێت. کەواتە، بەڕای ماکیاڤیللی، جەنگ، رەهەندێکی پێویست (ضروري) وەردەگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو، بەهیچ شێوەیەک شەڕخواز نییە. خوێنەر، لە هیچ شوێنێکی نووسینەکانیدا پێداهەڵگوتنی بێ مەرج بەسەر جەنگ بەدی ناکات؛ چونکە ئەو بە دووبارەکردنەوەی گوتەی سەرکردەی رۆمی، کلۆدیۆس پۆنتیۆس، پێی وایە "جەنگەکان تەنیا ئەو کاتە رەوان کە پێویست بن".[4]

بە بۆچوونی ماکیاڤیللی، چەمکی پێویست (الضرورة)، وەکو پرەنسیپی "پێویستبوونی رێکخستنی واقعی سیاسی" وایە. بەپێی ئەم پرەنسیپەیە کە مرۆڤەکان کاردەکەن، و وادەردەکەوێت کە "لە هەر شوێنێک توانای هەڵبژاردنی تاکەکەسانی گونجاو و لێهاتوو کەمتر بێت، گرنگی و بایەخی لێهاتوویی تاکەکەس زێتر دەبێت".[5] کەواتە چالاکییەکانی مرۆڤ بەپێی رێژەی دەسەڵاتی زەروورەت مانایان دەبێت. ئەگەر زەروورەت نەبێت، مرۆڤ ناتوانێت لە دونیای خۆیدا، سیستمێک بێنێتە کایەوە. هەر بۆیە جەنگیش لە باڵادەستیی شکستنەخواردووی یاسای زەروورەت رزگار نابێت. هەر لەبەر



ئەوەشە "لەرابردوودا، سەرکردەکانی سوپا کە ئاگاداری باڵادەستیی ئەم زەروورەتە بوون و دەیانزانی ئەم هۆکارە تا چەند سەربازەکان بۆ شەڕکردن هاندەدات، درێغییان نەدەکرد لە بەکارهێنانی ئامرازێک بۆ ملکەچ پێکردنیان بۆ ئەم زەروورەتە"[6]. بەڵام ئەگەر هەموو کارێک بە پەیڕەوی لە زەروورەتەوە ئەنجام بدرێت، کەواتە چالاکیی مرۆڤ چ رۆڵێکی دەبێت؟ بێگومان "زەروورەت لە زۆربەی ساتەکاندا، مرۆڤ بەرەو ئامانجێک رێنوێنی دەکات، لە شوێنێکدا کە عەقڵ لە بە کۆتایی گەیاندنی ئەم رێگەیەدا بێ توانایە"[7]؛ دەتوانین مرۆڤگەلێکی وا بدۆزینەوە کە، لەرێی سوود وەرگرتن لە هێزی ئەم زەروورەتە، بۆ گەیشتن بە ئامانج، دەتوانن دەست بۆ چالاکییە سیاسی و سەربازییەکان بەرن. ماکیاڤیللی، تایبەتمەندی بەکاربردنی زەروورەت بۆ سەرکەوتنی سیاسی و سەربازیی بە "لێهاتوویی" (Virtu) ناو دەبرد. لەبیری ماکیاڤیللیدا، چەمکی "لێهاتوویی" هاوواتای چەمکی "هێز"، "زیرەکی" و "ئازایەتی"یە. وشەی "لێهاتوویی" زێتر نیشاندەری تایبەتمەندیی خۆیی مرۆڤە نەک خەسڵەتە ئەخلاقییەکانی؛ ماکیاڤیللی ئەم زاراوەیەی بۆ "لێهاتوویی گەورە پیاوانی سەرکەوتوو" یان بۆ "دەستەمۆکردنی کایەی دەسەڵاتی پاشایەک، بە بەکارهێنانی لێهاتوویی" بەکاردەبات. کەواتە لە بەرهەمەکانی ماکیاڤیللیدا، چەمکی "لێهاتوویی" بەمانای ئامادەیی سوودوەرگرتن لە هەلومەرجی هەیی(موجود) بۆ گەیشتن بە مەبەست بەکاردەبرێت، بەڵام ئەو لەبەرانبەر چەمکی "لێهاتوویی"دا چەمکی "بەخت" (Fortuna)یش بەکاردێنێت. لە روانگەی ماکیاڤیللییەوە، "لێهاتوویی" بریتییە لە توانای جەستەیی و فیکریی مرۆڤ –و "بەخت"، نیشاندەری هێزی رێککەوتە

که پێویسته تاکی "لێهاتوو" بۆ گەیشتن بە ئامانج کەڵکی لێوەربگرێت. بە گوتەیەکی تر: "بەخت لەو جێیەدا هێزی خۆی نیشان دەدات کە هیچ کارێکیان بۆ وەستان لە بەرانبەریدا نەکردبێت و تووڕەییەکەشی ئاڕاستەی ئەولایە دەکات کە دەزانێت هیچ بەربەستێکیان لە بەرانبەری دانەناوە"[٨].

پێویستە لە پەیوەندیی دیالێکتیکیی نێوان "لێهاتوویی" و "بەخت" دا بەدوای سەرچاوەی دەسەڵاتدا بگەڕێین، و ماکیاڤیللی لەڕێی لێکۆڵینەوەی لە سەرچاوەی دەسەڵات فێرمان دەکات بیر لە لۆژیکی کۆمەڵایەتی و ئەو ڕۆڵەی کە سیاسەت لە بواری ئەم لۆژیکەدا دەیگێڕێت، بکەینەوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە، ماکیاڤیللی ئەم فکرە سەرەکییەمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوە کە سیاسەت لەو کردارانەدا خۆی دەنوێنێ کە تاکێک لە بەرانبەر تاکەکانی دیکەدا، بۆ هێنانەکایەی پەیوەندیی دەسەڵات و پەسندکردنی دەسەڵاتی خۆی لەلای ئەوان ئەنجامی دەدات. بەپێی ئەم واتایە، ژیانی سیاسی، لەگەڵ سەرهەڵدانی خاڵی هاوسەنگیی نێوان سیاسەتوان و خەڵکدا دەست پێدەکات. پێویستە ئەم خاڵی هاوسەنگییە، لە ڕێی ئەزموونەوە، لەکاتی هێنانەکایەی کەشوهەوایەکی پێویست بۆ پیادەکردنی دەسەڵات (واتە حکوومەتکردن) بدۆزینەوە. کەواتە، پێویستە هونەری سیاسەت بە "هونەری حکوومەتکردن" پێناسە بکەین.

ماکیاڤیللی، لەیەک کاتدا، لە دوو جۆر حکوومەت دەکۆڵێتەوە: حکوومەتە پاشایەتییەکان (لە بنەڕەتدا ناوی کتێبە بەناوبانگەکەشی "**لەبارەی حکوومەتە پاشایەتییەکان**" De Principatibus بوو و دوای مردنی گۆڕا بۆ "**میر**" Prince)، حکوومەتە کۆمارییەکان. لە بارەی



جۆری دووەم، ماکیاڤیللی کۆماری ڕۆما بە نموونە دێنێتەوە. کتێبێکی دیکەی ماکیاڤیللی ناوی "**چەند گوتارێک لەبارەی دە کتێبی یەکەمی تیتۆس لیڤۆس**"ە. مێژوو، کتێبی میری وەک شاکار هەڵبژاردووە و کتێبی **گوتارەکان**ی پشتگوێ خستووە. ئەم جیاکردنەوەیە هەڵەی زۆری لێکەوتۆتەوە کە زیانی هەم بە بەرهەمەکانی ماکیاڤیللی و هەم بە خودی ئەو گەیاندووە. هەر بەم هۆیەشەوە، حوکمگەلێکی هەڵەی لەبارەوە دراوە و وەک بیرمەندێک ناوی دەرکردووە کە تەنیا بیری لە پاشایەتی کردۆتەوە؛ لە کاتێکدا سەرلەبەری ئەو لێکۆڵینەوانەی لەبارەی "واقعی سیاسەت" ئەنجامی داون، داکۆکی لە حکوومەتی کۆماری دەکەن. دانانی ماکیاڤیللی لە ڕیزی کۆماریخوازان، هێشتا هەستی زۆران دەوروژێنێ و بەلانی کەم، سەرسامیان دەکات. بەڵام دوان لەبارەی کۆماریخوازێتی ماکیاڤیللی و حەزی توندی بۆ ئازادی، بەڵگە و بەهانەیەکە بۆ ئەوەی قسەی زێتر لەبارەی دەوڵەمەندیی بەرهەمەکانی بکرێت. هەر ئەم بەڵگە و بەهانەیە وامان لێدەکات کەسایەتیی ئەو لەو نووسینانە جیابکەینەوە کە لەبارەی ماکیاڤیللییەوە نووسراون. لە ڕابردوودا، جان جاک ڕۆسۆ و سپینۆزا پەیڕەوییان لەم میتۆدە دەکرد و هەردووکیان هەوڵیان داوە ڕۆشناییە بنچینەییەکە بۆ بەرهەمەکانی سپینۆزا بگێڕنەوە و لە تۆمەتی هاوسەردەمیانی پاکی بکەنەوە. ڕۆسۆ لە بەشی شەشەمی کتێبی سێیەمی **پەیمانی کۆمەڵایەتی**دا لە ڕێی هێنانەوەی ڕستەیەکی بەناوبانگەوە بە ئاشکرایی ڕادەگەیەنێت کە "میری ماکیاڤیللی، کتێبی کۆماریخوازانە"[٩].

ئەم ڕستەیە دەریدەخات کە ڕوسۆ هەوڵی داوە لە ڕوانگەیەکی نوێوە بەرهەمەکانی ماکیاڤیللی بخوێنێتەوە. سپینۆزاش هەوڵێکی لەم

شێوەیەی داوە و لە حەوتەمین بڕگەی بەشی پێنجەمی کتێبی بەناوبانگی **"نامەیەک لەبارەی سیاسەتەوە"** پێشنیار دەکات بەرهەمەکانی ماکیاڤێللی سەرلەنوێ تەفسیر بکرێنەوە. سپینۆزا دەڵێت: "لەوانەیە ماکیاڤێللی بیویستبێ دەریبخات کە تا چ رادەیەک پێویستە خەڵک لە سپاردنی چارەنووس و رزگاربوونی خۆیان بە دەستی تاکەکەسێک خۆیان بپارێزن؛ چونکە ئەگەر ئەو کەسە لەو بیرەدا کرچ و کاڵ نەبێت کە دەتوانێت دڵی هەموو کەسێک بۆ لای خۆی رابکێشێت، ناچارە بەردەوام لە مەترسییەکان رابکات و ناچارە هەمیشە بە ئاگابێت و بەتایبەت بیر لە گیانی خۆی بکاتەوە؛ ئەو کەسە بە پێچەوانەوە پێویستە هەمیشە داو لەسەر رێی خەڵک بنێتەوە و خەمیان لێ بخوات. پێویستە ئەم حوکمە لەبارەی ئەم نووسەرە باڵادەستە پەسند بکەم کە ئەو، بەڕای هەمووان، لایەنگری ئازادییە و بیروڕای بەهێزی لە بارەی چۆنیەتی پارێزگاریلێکردنی خستۆتەڕوو"[١٠].

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بڵێین تێگەیشتن و رۆشنبینیی هیچ یەک لەم دوو نووسەرە نەیتوانیوە ماکیاڤێللی لەو تۆمەتە پاکبکاتەوە کە دەڵێ ئەو پیاوێکی "بە وردە و فێڵباز" بووە. چونکە زۆربەی خەڵک تەنانەت پێش خوێندنەوەی بەرهەمەکانیشی، حوکمی لەسەر دەدەن؛ ئەفسانەی ماکیاڤێللیزم، لە سنووری بەرهەمەکان و کەسایەتیی ئەو تێپەڕی کردووە و بەکاربردنی سیفەتی "ماکیاڤێللیست" لە هەموو زەمانەکاندا، زێتر لە بەرهەمەکانیشی، برەوی سەندووە. لە هزری خەڵکدا، "ماکیاڤێللیزم" بە واتای کۆی بیروڕا و برواکانی ماکیاڤێللی نییە. ماکیاڤێللی هیچکات "ماکیاڤێللیست"، بەواتا باوەکەی، نەبووە؛



چونکە "ماکیاڤێللیزم واتە: بەستنەوەی بێپایەخانەی بنەمای ئەخلاقی بە سیاسەتەوە"[١١]. لەکاتێکدا ماکیاڤێللی هیچ کات دەستی لە تۆژینەوەی ئەخلاقی خەڵک (جا چ ژێردەست بن یان پاشا) لە رێی شیکردنەوەی رەفتاری کۆمەڵایەتییان، هەڵنەگرت. جگە لەوە، ئەگەر لای ماکیاڤێللی سیاسەت وێنەیەکی نا ئەخلاقیی هەبێ لەبەر ئەوەیە کە سیاسەت ماهییەتێکی ناپیرۆزی هەیە. لەراستیدا ماکیاڤێللی بە پێی ئەو تێگەیشتنەی کە لەمەڕ سیاسەت هەیەتی، بۆ دابینکردنی هەلومەرجی پتەوکردنی دەوڵەت، هەموو کارێک بە ڕەوا و رێگەپێدراو دەزانێت و لەبەرئەوەش سیاسەت لە هەموو جۆرە رەهەندێکی پیرۆز دادەماڵێت. بە دەستەواژەیەکی دیکە، ماکیاڤێللی، بە وەلانانی هەموو جۆرە ئامانجێک کە کارایی پیادەکردنی دەسەڵات لەکەدار دەکات، سیاسەت لەسەر بنەمای ئەخلاقی سوودخوازی سەرلەنوێ بنیات دەنێتەوە. بەم پێیە ئەو، لە رێی خۆ رزگارکردن لە دەمارگیرییەکانی رابردوو پرسیارێکی سیاسیی نوێ لەسەر بنچینەی تێڕوانینێکی ئەخلاقیی نوێتر دەخاتەڕوو. بەڵام پێویستە لە یادمان نەچێت کە لە رێی وەلانانی گشت دەمارگیرییەکانی خۆی مێژوو وەلانانێت، چونکە لە رێی تۆژینەوەی مێژووەوە، وەڵامێک بۆ پرسیارەکەی دەدۆزێتەوە. ئەو دەزانێت کە خەڵک ناگۆڕێن، چونکە سروشتیان هەمیشە یەکە. ئەوان، وەک ئەو خەڵکانە وان کە ٢٠ سەدە پێش ئێستا دەژیان. ئەوان ناپاک، لەخۆبایی و رواڵەتسازن. ماکیاڤێللی لەم راستییە ئەو وانەیە وەردەگرێت کە لە سیاسەتدا "دەبێ رێوی بین و داودۆز بین و دەبێ شێر بین و گورگەکان راوبنێین"[١٢]. بەکارهێنانی سیفەتی "ماکیاڤێللییانە" بۆ ماکیاڤێللی خۆی لەبەر ئەم حوکمە بووە. بەڵام ماکیاڤێللی خۆی لە

"ماکیاڤیللیزم" بە دوور دەگرێت، چونکە وەک چۆن بەرهەمەکانی لە "ماکیاڤیللیزم" بە دوورن، خۆیشی لە "ماکیاڤیللییانە بوون" بە دوورە.

کەواتە پێویستە بزانین کە ماکیاڤیللیی راستەقینە کێیە؟ ئایا ئەو، بەو جۆرەی کە رۆسۆ و سپینۆزا گوتوویانە "کۆماریخواز و لایەنگری ئازادی" بووە یان بەو شێوەیەی کە چەند سەدەیەک لەمەوبەر باو بووە، ماکیاڤیللی کاتێک کە لەبارەی حکوومەتی پاشایەتییەوە دواوە، "بیرمەندێکی بەدبین و سارد" بووە؟ ئایا ناتوانین هەمان ئەو رستەیەی فەیلەسووفی فەرەنسی "ئالن" کە لەبارەی دیکارت دەیڵێت دووبارەی بکەینەوە و بڵێین: "ماکیاڤیللیی راستەقینە هەمان واقعی ماکیاڤیللییە"؟

هەر چۆنێکی بێت پێویستە بڵێین ماکیاڤیللیی راستەقینە، تاکێکی تازە پێ گەیشتووە. ئەو کەسەیە کە تا ئێستاش لە ئەزموونەکانی خۆی لە بواری سیاسەت و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵک، بەهرەمەندمان دەکات. بەتایبەت کە ئەزموون و ئەنجامەکانی تۆژینەوە لە سروشتی خەڵک، لە پرێکدا کۆن نابن. هەر بۆیە هیچ کەس ناتوانێت "هەنووکەیی و سەردەمیبوونی" بیروڕاکانی ماکیاڤیللی رەت بکاتەوە؛ و تا ئەو کاتەی کە سیاسەت، یەکەم بابەتی سەرقاڵیی فیکریی خەڵک بێت، ناوی ئەو لە پەرستگای مێژوودا بە تۆمارکراوی دەمێنێتەوە.

## پێشەکی

"پێوستە ماکیاڤیللی بە شاهێدی نموونەییانەی سەردەمی ڕێنسانس لە قەڵەم بدەین"

*ئەرنست کاسیرەر*

## سیاسەت لە سەردەمی ڕێنسانسدا



تا ئێستا مێژووی ئادەمیزاد جگە لە مێژووی کۆششەکانی مرۆڤ لە پێناو دۆزینەوەی خۆ و دونیاکەی شتێکی دیکە نەبووە. لە نێوان ئەو سەردەمانەی کە یارمەتی پێشکەوتنی مرۆڤیان لە ڕێی ناسینی خۆی و دونیاکەی داوە، سەردەمی ڕێنسانس ئاستێکی پلەیەکی هەیە.

ئەمڕۆش، هەر جارەی کە لاپەڕەکانی ئەم ڕووداوە فیکرییە هەڵدەدەینەوە، خۆمان لە بەرانبەر شارستانیەتێکدا دەبینینەوە کە وەک هیگڵ دەڵێ: "بۆ یەکەمجار، دوای تۆفانە دوور و درێژەکان، موژدەی گەڕانەوەی ڕۆژە خۆشەکان دەدات"[١٣]. لە ڕاستیدا وشکبوونی سەرچاوەی هێزی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست بووە هۆی ئەوەی دەرگای نوێ بە ڕووی گیانی پشکێنەرانەی مرۆڤی سەردەمی ڕێنسانسدا بکرێنەوە. ویستی دۆزینەوەی سنوورە نوێیەکان نەک تەنیا لە دونیای زانست و هونەرەکاندا، بەڵکو لە بواری جوگرافیاشدا بووە هۆی ئەوەی وێنەگەلێکی نوێی مرۆڤ و گۆی زەوی و جیهان دەربکەون. کەواتە دەتوانین هاودەنگ لەگەڵ ئەلکساندەر کویرێ بڵێین [پێویستە] مرۆڤ لە جیهانی بەرتەسک و داخراوی سەدەکانی ناوەڕاستدا قاچ بخاتە دەرەوە بۆ ئەوەی هەنگاو بۆ ناو جیهانی بێ کۆتایی ڕێنسانس بهاوێژێ. لە ساڵی ١٥٤٣ نیکۆلاوس کۆپەرنیکۆس لە ڕێی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی بە ناوی: **خولانەوەی هەسارەکانی**

**ئاسمان** (De Revolutionibus Orbium Coelestium) بۆچوونی خۆی لەبارەی گەردوون دەردەبڕێت و ڕێگە بۆ کۆتایی هێنان بە ئەنتۆلۆژیای (بوونناسی) ئەرستۆیی خۆش دەکات. بەڵام لە ڕاستیدا دوای تاقیکردنەوەکانی گالیلۆ گالیلیێ و بڵاوبوونەوەی تیۆرەکانی، دابڕانی ئەپستمۆلۆژی لە سیستەمی بیرکردنەوەی ئەرستۆییدا، سەریهەڵدا. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لە بیرمان نەچێت کە لە نێوان سەردەمی کۆپەرنیکۆس و گالیلیێدا، فەیلەسوفان و زانایان و هونەرمەندانی دیکە، مەشخەڵی ڕێنسانسیان بەرزکردەوە و تەنانەت کەسێکی وەک جیۆردانۆ برۆنۆ (کە لە ١٦ی شوباتی ١٦٠٠دا بەهۆی ڕەتکردنەوەی تیۆری ئەرستۆیی لە بارەی جیاوازی "جیهانی بەرز" لە "جیهانی نزم"دا و جەختکردنی لەسەر کۆتایی نەبوونی گەردوون، لە شاری ڕۆما سوتێنرا) گیانی خۆی کردە قوربانی بیروباوەڕ و بۆچوونەکانی.

بەڵام ئایا مەرگی برۆنۆ لە نێو گڕەکانی ئەو ئاگرەی کە دەزگای پاپا بۆ سووتاندنی ئەوی داگیرساندبوو تەنیا بەهۆی جیهانبینییە نوێیەکەوەبوو؟ یان، بەو شێوەیەی کە ئەرنست کاسێرەر دەڵێت، هۆی کوشتنی وی بۆ ئەوە بوو کە لەگەڵ نەمانی ئەو دا "ئامانجی سەربەخۆیی تاکەکەسی و هەڵبژاردن"- کە دڵ و گیانی گشت مرۆڤەکانی سەردەمی ڕێنسانسی هەڵدەکزوراند- دوور بخرێتەوە؟ لە نێوان ئەم جۆرە کەسانە و لە سەردەمی ڕێنسانسدا، ماکیاڤیللی دەبینین کە پێی وایە "ئامانجی سەربەخۆیی تاکەکەسی و هەڵبژاردن" لە پەیوەندیی نوێی نێوان مرۆڤ و دەسەڵاتی دەوڵەتدا خۆی دەردەخات. ئەم پەیوەندییە نوێیە، لە دەرکەوتنی وێنەیەکی نوێی



سیاسەتەوە (واتە سیاسەت وەک پیادەکردنی ناپیرۆزانەی دەسەڵات) سەرچاوە دەگرێت. بە دەستەواژەیەکی دیکە، لە سەردەمی ماکیاڤیللی بەدواوەیە کە مەسەلەی "دەسەڵاتی سیاسی لە خودی خۆیدا" باسی لێوە دەکرێ، بێ ئەوەی زەروورەتی دەستێوەردانی دەسەڵاتێکی تری وەک دەسەڵاتی دەزگای پاپا- بۆ پشتڕاستکردنی دەسەڵاتی سیاسی و پشتیوانی لێ کردنی- پێویست بێت. لەو کاتە بە دواوە سیاسەت لە پیرۆزکردن جیابۆوە. بەم شێوەیە، سیاسەت، دیسان دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤەکان و [لە هەمان کاتدا] سیستمی مەسیحییانەی دەسەڵات بەرەو دواوە پاشەکشەی پێ دەکرێت. ئەم ئاڵوگۆڕە ناوخۆیی و جەوهەرییەی سیاسەت بەم شێوەیە خۆی دەنوێنێ کە سیاسەتوان کارەکانی خۆی تەنیا ئاڕاستەی ئامانجێکی تایبەت دەکات، ئامانجێک کە بە پێی ماهییەتی سیاسەت، نەک بەپێی حەقیقەتێکی باڵا دیار دەکرێت. بەم واتایە، ئێمە شاهێدی "لە دایکبوونەوەی (Re-naissance) سیاسەت"ین لە بیرکردنەوەی ماکیاڤیللیدا؛ بیرکردنەوەی ئەو پشت بە پێداویستیی بۆ سەربەخۆیی و ئۆتۆنومیی تاک دەبەستێ، نەک پەیوەندی بەو سەرچاوەوە هەبێ کە لە دەرەوەی ئەوەوەیە. ماکیاڤیللی پێویستبوونی سەربەخۆیی و ئۆتۆنومیی تاک لە پرسیارێکدا لەبارەی بنەمای سیاسەت دەخاتەڕوو. بەڵام مەسەلەی بنەمای سیاسەت، پەیوەندی بە مەسەلەی بیرکردنەوەی سیاسییەوە هەیە. بە پێی ئەمە، پەیوەندیی سیاسەت بە بیرکردنەوەوە، لە شێوەی پەیوەندی نێوان "سیاسەتی بیرکردنەوە" و "بیرکردنەوەی سیاسی"دا خۆی دەنوێنێت. بە واتایەکی دیکە، پێویستە سنووری سیاسەت وەک بەرهەمێک کە لە ئەنجامی بیرکردنەوەی سیاسییەوە دروستبووە دیاربکرێت. بەڵام





گشت سەختییەکە لەوە دایە کە چۆن هەلومەرجی سەرهەڵدان و نەشونماکردنی بیرکردنەوەیەکی لەم جۆرە روون بکەینەوە. بەم شێوەیە پێویستە بڵێین ماهییەتی ئەم بیرکردنەوەیە، لە سنووری تێگەیشتنی سادەی ئەزموونە سیاسییەکان تێپەڕ دەکات. بەڵام هەر لەم ئەزموونە سیاسییانەشدا دەتوانین بنەما و لۆژیکێک کە بیرکردنەوەی سیاسی هەر سەردەمێک دێنێتەکایەوە، بدۆزینەوە.

لە سەردەمی رێنسانسدا، ئەم لۆژیکە لە شێوەی بەردی بناغەی شۆڕشێکی راستەقینە لەناو بنەماکانی بیرکردنەوەی سیاسیدا، دەردەکەوێت، شۆڕشێک کە دەبێتە هۆی لێکجیاکردنەوەی دوو شێوازی بیرکردنەوەی سیاسیی جیاواز: لە لایەک شێوازی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست - کە پێویستە لە ئاوات و خواستی یەکگرتنی ئایین و سیاسەتدا بە دوای بنەماکانیدا بگەڕێین- واتە روانگەی ئایینی بۆ دەسەڵاتی سیاسی کە پشت بە یەکگرتنی ئیمپراتۆریای رۆمانی و کلێسا دەبەستێ. لە لایەکی دیکەشەوە، گیانی رێنسانس کە لە شکستی بیرۆکەی سەدەکانی ناوەڕاست لە بارەی هێنانەکایەوەی "ئیمپراتۆریای مەسیحی"یەوە سەرچاوە دەگرێت و وادەکات بنچینەی پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیی نوێی پشتبەستوو بە فەرمانڕەوایی سەرهەڵبدات و رێگەی نوێکردنەوەی سیاسی رۆشن بکاتەوە. بەم شێوەیە پرۆسەی گۆڕان و گەشەکردنی تیۆرە سیاسییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ بیرۆکەی دروستکردنی دەوڵەتی نوێ لە سەردەمی رێنسانسدا، نیشاندەری دوو جۆرە تێڕوانینە سەبارەت بە مەسەلەی دەسەڵاتەوە. لە سەردەمی رێنسانسدا، بیرۆکەی "کامڵبوونی دەسەڵاتی نائایینی" جێی واقعی



"دەسەڵاتی دابەشبوو و فەرمانڕەوای بە کەموکووڕ"ی سەدەکانی ناوەڕاست دەگرێتەوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە، دەسەڵاتی فەرمانڕەوا تەنیا پەیوەستە بە خۆیەوە، لە بارێکدا کە لە کۆمەڵگای سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئیمپراتۆر ناچارە لە کارەکانیدا بەرسڤدەری بەردەمی دەزگای پاپا بێت. لە بنج و بنەوانی وێنەی نوێی دەسەڵات لە سەردەمی رێنسانسدا، گۆڕانی چەمکی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ "مرۆڤ" دەبینرێت. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، مرۆڤ، وەک بوونەوەرێک لە قەڵەم دەدرا کە جگە لە رزگاربوونی خۆی نەدەبوو هیچ ئامانجێکی دیکەی هەبێت. لە بارێکدا کە لە سەردەمی رێنسانسدا زێتر لە هەر شتێک سەرنجی داهێنەرێتی و بەرهەمهێنەرێتیی مرۆڤ دەدرێت. لە روانگەی بیریارانی سەردەمی رێنسانسەوە، ئادەمیزاد بوونەوەرێکی ئازادە. مرۆڤی سەردەمی رێنسانس بیر لە ژیانی دوارۆژ (ئاخیرەت)ی خۆی ناکاتەوە و بۆ جەوهەری کۆمەڵایەتی- مێژوویی خۆی دەگەڕێتەوە. کەواتە، خولیای یەکەمی ئەوەیە کە وەک فاکتەر و بکەرێکی مێژوو، سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمیی کارکردن وەدەست بێنێت. ئەم گێڕانەوەی ئیعتوباری مرۆڤە و گۆڕانی بۆ بکەری مێژوو،ئەنجامەکەی ئەوەیە کە مرۆڤ لە تەوقی کۆیلایەتی کە جیهانبینیی سەدەکانی ناوەڕاست لە ملی ئەوی کردبوو ئازاد دەبێت. دەرکەوتنی ئەم جۆرە تێڕوانینە بۆ مرۆڤ لە بەرهەمە هونەرییەکانی سەردەمی رێنسانسیشدا دەبینرێت. لە هونەری ئەو سەردەمەدا، هەوڵدان بۆ دەرخستنی جوانیی مرۆڤ و رێزلێنانی بەرچاو دەکەوێت. لەم سەردەمەدا، جوانی پێش هەموو شتێک، واتە جوانیی مرۆڤ و ئامانجی هونەر بریتییە لە بینین و رەنگپێدانەوەی جوانیی جەستەی

مرۆڤ. هەر لەبەر ئەمە لە بەرهەمە هونەرییەکانی سەردەمی
رێنسانسدا گیانی مرۆڤخوازی ئەوەندە زیندوو و بە هێز بوو کە لە
زۆربەی ئەو شاکارانەی کە بیناسازان، پەیکەرتاشان و وێنەکێشانی
ئەو سەردەمە دایانهێناوە، بە ئاشکرایی خۆی دەنوێنێت. مرۆڤی
سەردەمی رێنسانس لەرێی روونکردنەوەی رەوشی خۆی لە
بەرانبەر جیهاندا، دەرکەوتەی هونەریی خۆیشی دەئافرێنێت. هەروەها
پێویستە بڵێین ئەو هێز و گەورەییە مەعنەوییەی کە مایکل ئەنجیلۆ و
دونالێلۆ بە پەیکەرەکانی خۆیان دەبەخشن، ئەنجامی تێگەیشتنێکی
نوێیە کە هەر یەک لەو دووانە- وەکو هاوچاخانی خۆیان- لەمەڕ
چەمکی جوانی و پلەو پایەکەی لە ژیانی هونەری خۆیاندا هەیانە. لە
راستیدا جوانیناسیی سەردەمی رێنسانس بە لەدەستدانی ئەو رۆڵەی
لە بەرانبەر ئەخلاقی کلێساییدا- کە بەرزترین دەرکەوتەی هونەری
تەنیا لە رواڵەتەکەیدا بەدی دەکرد- لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەیبوو
ئازادی و ئیختیارێکی نوێ بە هونەر دەبەخشێت. بەم شێوەیە، هونەر
لە پلەو پایەی "ئامراز" دێتە دەرەوە و دەبێتە "ئامانج". بەڵام
هونەرمەندانی سەردەمی رێنسانس، لەگەڵ ئەوەی کە لە کەشوهەوای
قورس، بەڵام [لەهەمان کاتدا] لە پیرۆزیی هونەری سەردەمی
«گوتیک» رزگاربوون، هێشتاش دەیانبینی کە لە جوانییە روح
سووکەکانی سەردەمی ئەوان، زوهد و خۆپارێزیش دەردەکەوێت. بەم
پێیە هونەرمەندێکی گەورەی وەک رۆفائیل: "جوانی لە ناوخۆیدا، بە
دەرکەوتنی زوهد و خۆپارێزی" لە قەڵەم دەدات. واقعبینیی سۆزداری
و ئەو گیانەی کە وێنەکێشی رێنسانس بە کەسایەتییەکانی تەوراتی،
دەبەخشێت، دیمەنێکی نوێ لە بەرانبەر چاوی بینەری ئایینی ئەوسا



دەکاتەوە. چاکترین نموونەی ئەو دیمەنە دەتوانین لە هەر دوو تابلۆی
"قامچی وەشاندن لە مەسیح"ی بەرهەمی پیترۆ دولافرانچسکا و
"سەرەمەرگ لە باغی زەیتوندا"ی جیۆڤانی بلینیدا ببینین. ئەم دوو
تابلۆیە، ئەم گوتارەی لیۆناردۆ داڤینچی کە دەڵێ: "وێنە کێشان،
شیعرێکی بینراوە" لە یاددا زیندوو دەکاتەوە. رێنسانس وەکو
دەرکەوتنی شهودیی شیعر سەیری پەیکەری مرۆڤی دەکرد. هەروەها
گرنگیدان بە پەیکەری مرۆڤ لە سەردەمی رێنسانسدا، ئەنجامی
گرنگینەدانی سەدەکانی ناوەڕاست بوو بەم شتە. تابلۆی "خەوی
ڤینۆس" بەرهەمی *تی سیین* و پەیکەری "داوود"ی *مایکل ئەنجیلۆ*،
هەردووکیان رەمزی بەهاگەلێکن کە لە سەردەمی رێنسانسدا بە
پەیکەری مرۆڤ بەخشراوە و هەر لەو سەردەمەدایە کە هەماهەنگی و
کەمالی (تەواوێتی) جەستەی مرۆڤ لە بەرهەم و شاکارە
هونەرییەکاندا دەردەکەوێت. هەر بۆیە، بیرۆکەی گەڕانەوە بۆ
سەردەمی کۆنی یۆنان و رۆمیش هەر لەو خواستەوە سەرچاوە
دەگرێت، چونکە پاشماوەی بەرهەمە هونەرییەکانی ئەو سەردەم بە
نموونەی راستەقینەی هەماهەنگی و کەمال لەقەڵەم دەدرێن. لەراستیدا
سەردەمی کۆنی یۆنان و رۆمان، دەبێتە بناغە و بنچینەی دەرکەوتنە
رۆحییەکانی رێنسانس. ئەم گەڕانەوەیە بۆ رابردوو، نیشانەی هەوڵ و
کۆششێکە کە داهێنەران بۆ رزگاربوون لە کۆت و بەندەکانی
سەدەکانی ناوەڕاست ئەنجامی دەدەن. کەواتە رێنسانس وەک لە
دایکبوونەوەی سەردەمی کۆن، لە داوێنی سەردەمی نوێدا، وەک
دەرکەوتنی رابردوو لە ئێستادا، خۆی دەردەخات. دەتوانین بیرۆکەی
بنیاتنانی نوێ لەسەر بنچینەی کۆن لە پرۆسەی گەڵاڵەبوونی چەمکی

"بەردەوامی"شدا بدۆزینەوە. هەر لەبەر ئەوەیە کە ئەم چەمکە، دەبێتە تەوەری سەرەکی و ناوەندیی شێوازی بیرکردنەوەی باو. لە راستیدا، گۆڕانی شێوازی کۆن بۆ سیستمی نوێ تەنیا لە ئەنجامی "دروستبوونی رابردوو بەپێی ئێستا"روودەدات. هەربۆیە، بۆ دروستکردنی "داهاتوو" پێویستە "ئێستا" دەرک بکەین و لە روانگەی ئەوەشەوە دووبارە سەیری "رابردوو" بکەینەوە. بەگوتەیەکی تر، "رابردوو" جگە لە "لایەنێک لە ئێستا" شتێکی دیکە نییە. "ئێستا" بریتییە لە "ئەوەی ئێستا هەیە"، لە بارێکدا کە "رابردوو" بارودۆخێکە "دەرکەوتووە و گۆڕاوە". لەو رووەوە دەتوانین چەمکی "دابڕان" بەخەسڵەتی سەردەمی رێنسانس لەقەڵەم بدەین. ئەم دابڕانە، دونیای رێنسانس لە دونیای پێش خۆی جیادەکاتەوە؛ چونکە دروستبوونی هەر دونیایەک، پێویستی بە کۆتایی هاتنی دونیای پێش خۆی هەیە. تایبەتمەندیی دونیای رێنسانسیش ئەوەیە کە دونیای سەدەکانی ناوەڕاست، بە گشت نەریتەکانییەوە دوور دەخاتەوە. بەڵام وەک گوتم، ئەم "نوێیە" رەهەندێکی دیکەشی هەیە، رەهەندێک کە بریتییە لە دووبارە بیرکردنەوە لە بەهاکانی نەریتی یۆنانی- رۆمانی لەودیوی دەستکەوتەکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە. هەر لەبەر ئەوە پێویستە بڵێین بابەتی سەرەکی بیرکردنەوەی رێنسانس لە رێی ئەنجامدانی دوو کار لەبارەی رابردووەوە، شێوە دەگرێت. کاری یەکەم، بریتییە لە دوورخستنەوەی جیهانبینیی سەدەکانی ناوەڕاست، لە بارێکدا کە کاری دووەم بریتییە لە هەبوونی عەشق و خۆشەویستییەکی گەورە بۆ دونیای کۆن، و لاسایکردنەوەی وەک "کارێکی بنچینەیی و سەرەکی". دەتوانین جێبەجێکردنی ئەم بنچینەیە لە گشت ئاستەکانی



ژیانی فیکری و هونەریی سەردەمی رێنسانسدا بەدی بکەین. با وەبیر خۆمان بێنینەوە کە "لورێنتسۆد مەدیچی لە فلۆرەنسادا، هەموو ساڵێک، یادی رۆژی لە دایکبوونی ئەفلاتوونی دەکردەوە، دانتێ بۆ نیشاندانی دۆزەخ، ڤێژ- لیۆسی وەک رێنیشاندەرێک هەڵبژاردبوو؛ ئەراسمۆس، سیسیرۆی وەک قەشەیەک حسێب دەکرد"[١٤]. درێژبوونەوەی رێنسانس بەرەو لای دونیای کۆن، لەگەڵ رەتکردنەوەی بیروراکانی سەدەکانی ناوەڕاست، بەهێزتر دەبێت. تەنانەت دەتوانین بڵێین رێنسانس دونیای کۆنی دەپەرست بۆ ئەوەی بەهەر نرخێک بێت خۆی لە کۆت و زنجیرەکانی سەدەکانی ناوەڕاست رزگاربکات.

لەوەی تا ئێستا گوتمان دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە رێنسانس دوو خەسڵەتی لێکجیای هەیە کە دژ بە یەکترن. لە سەردەمی رێنسانسدا، دەتوانین هەم ویست و خواست بۆ درێژەدان بە نەریتەکانی سەردەمی کۆن و هەم رەتکردنەوەی رەهەندە سیاسی- کولتوورییەکانی "نەریتی ئۆگۆستینیزم"* لە کایەی بیرکردنەوەدا ببینین؛ لەوانەیە بتوانین بڵێین گومان و خەیاڵی خەڵکی رێنسانس لە شێوەی کۆکردنەوەی ئەم دوو ئاراستەدا دەردەکەوێت. کەواتە دەتوانین بڵێین لەم سەردەمەدا "بەردەوامیی دابڕان" هەیە، نەک "دابڕانی بەردەوامی". چونکە بە پچڕانی رستەی پەیوەندییەکان لەگەڵ شێوازی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست زەمینەی پێویست بۆ سەرهەڵدانی "بەردەوامی بەخشین بە بیروڕا و نەریتەکانی سەردەمی

* ئۆگۆستینیزم نیسبەتە بۆ "قەشە ئۆگستین" –و.

کۆن" دێتە ئاراوە. بە واتایەکی دیکە، پێویستە لەناو سەرهەڵدانی بیرۆکەی "دابڕان"دا بە دوای هەلومەرجی پێویست بۆ بیرۆکەی "بەردەوامی" بگەڕێین. کەواتە، گەڕانەوەی ڕێنسانس بۆ رابردوو، ئەنجامی دابڕانێکە لە رابردوویەکی دیکە (واتە سەدەکانی ناوەڕاست). ئەم شتەش، واتە نرخدانان بۆ جۆرە "رابردوو"ێک نیشانەی جۆرە هەڵبژاردنێکی رابردووە، هەڵبژاردنی رابردوویەکی دیاریکراو لە نێوان رابردووە جۆراوجۆرەکاندا، هەڵبژاردنێک کە چارەنووسسازە. هەموو "نوێی" ڕێنسانس لە هەڵبژاردنی "رابردوو"دایە، رابردوویێک وەک "ڕێنوێنیکەری ئێستا". تایبەتمەندی سەرەکیی بیرکردنەوەی ڕێنسانس، هەمان سوود وەرگرتنە لە ئەزموونەکانی رابردوو بۆ چاکتر بەڕێوەبردنی "کاروباری ئێستا". ئەم شێوازەی بیرکردنەوە، هاودەم لەگەڵ بایەخدانی ماکیاڤیللی بە مێژووی سەردەمی کۆن، کاردەکاتە سەر بیروڕا سیاسییەکانی، هەروەها هەموو ئەو نموونانەی کە بۆ روونکردنەوەی بیروڕاکانی خۆی دەیانهێنێتەوە، لە نووسین و گوتراوەکانی مێژوونووسانی سەردەمی کۆن وەریان دەگرێت؛ لە نێوانیاندا بەرهەمەکانی پۆلیپۆس، سیسرۆ و تیتۆس لیڤیۆس شوێنگەیەکی دیار و هەڵکەوتوویان هەیە، چونکە ماکیاڤیللی تیۆری "دەوریبوونی رووداوە سیاسییەکان" لە دوو مێژوونووسەکەی یەکەم وەردەگرێت. ئەو لە بەشی دووەمی کتێبی یەکەمی "گوتارەکان"دا باسی ئەم تیۆرە دەکات و دەڵێت: "چارەنووسی گشت دەوڵەتەکان ئەوەیە کە ئەم خولە بەڕێ بکەن. لە راستیدا کەم دەوڵەتی وا دەتوانین ببینین کە لە ژیانی خۆیدا، بگەڕێتەوە بۆ شێوەی سەرەتایی و یەکەمی خۆی. لە راستیدا تەمەنی دەوڵەتەکان ئەوەندە درێژ نییە کە تێیدا



بتوانن چەندین جار گۆڕانکاریی دەوری بە خۆیانەوە ببینن. ئەوانە دووچاری چەندین تەنگوچەڵەمەی جۆراوجۆر دەبنەوە، ئەم نەخۆشیانە ماندوویان دەکات، بەرە بەرە هێز و عەقڵیان لێ دەستێنێتەوە و دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوانە دوای ماوەیەکی کەم، بچنە ژێر رکێفی دەوڵەتێکی دراوسێی ئەوتۆ کە بناغە و پێکهاتەکەی ساغترە. بەڵام ئەگەر ئەم دەوڵەتانە بەسەر ئەم مەترسییەدا سەربکەون، دەبینین ئەوانە هەتا هەتایە لە هەمان خولی گۆڕان و وەرچەرخاندا دەمێننەوە"[١٥].

ماکیاڤیللی لەبەر ئەوە تیۆری "خولی هەمیشەیی" بەکاردەهێنا، چونکە "واقعی دەوڵەت" دەخاتە بەرانبەر ئامانجی زاهیدانەی ئەخلاقی مەسیحییەوە. ئەو لەو ڕێیەوە، تەوەری ئەو باسە سیاسییەی کە پەیوەندی بە مەسەلەی رزگاریی رۆحی مرۆییەوە هەیە (بەو شێوەیەی کە لە تیۆرە سیاسی- ئایینییەکانی ئەراسمۆسی هاوچاخی خۆی یان بە شێوەیەکی شاراوەتر لە یۆتۆپیزمی مرۆڤدۆستانەی تۆماس مۆردا دەبینرێت) بەرەو لای بیرۆکەی ملکەچکردنی تاک بۆ دەوڵەت راکێش دەکات. بە رای ماکیاڤیللی، هەموو چەشنە ئەخلاقێک دەشێ لە بیرکردنەوەی سیاسیدا بەرجەستە ببێت، چونکە بە بڕوای ئەو پێویستە ئەولەوییەت بدرێت بە سیستمی کۆمەڵایەتی. ئەو بڕوای بە ئامانجی دانتێ نییە کە هەوڵیدەدات یەکێتییەک لە نێوان پەتروسی قەشە و سیزاردا دروست بکات؛ بە رای ئەو "بەرژەوەندیی دەوڵەت" گرنگییەکی پلەیەکی هەیە. هەر لەبەر ئەوە پێی لەسەر زەروورەتی جێبەجێکردنی سیاسەتێکی واقعبینانە دادەگرت کە هەوڵی هێنانەکایەی هەلومەرجی بەردەوامبوونی ژیانی دەوڵەت بدات و رایدەگەیاند کە

دەوڵەت دەبێ لەو قومارەدا بباتەوە کە لەسەر "هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی" لە نێوان حاکمان و حوکم لەسەر کراواندا لە ئارادایە. کەواتە ئەو پرسیارەی کە ماکیاڤێللی هەوڵدەدات وەڵامی بداتەوە، ئەوەیە کە پێویستە چۆن و لە چ ڕێگەیەکەوە کۆمەڵگا ڕێک بخرێت؟ هەر لەو ڕوانگەوە هەوڵدەدات لە ڕێی لێکۆڵینەوە لە نموونەی سیاسیی دەوڵەتەکانی سەردەمی کۆن بەرنامەیەک بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگا، لەسەر بنەمای حکومەتی کۆماری دابڕێژێت؛ چونکە "ماکیاڤێللی وای بۆ دەچوو سەرەنجام ئامانجی هێنانەکایەوەی کۆمارێکی سەقامگیر دێتەدی"[١٦]. ئەو سەردەمەی کە ماکیاڤێللی ئێمەی بۆ دەگێڕێتەوە، سێ سەدە و نیوی مێژووی ڕۆمان دەگرێتە خۆ. ئەم سەردەمە، لەگەڵ هێنانەکایەوەی تریبۆنا (ئەنجومەنی شورایی بۆ تاوتۆکردنی پرۆژە قانوونیەکان) لە ڕۆما ساڵی ٤٩٣ پ. ز (واتە ١٧ ساڵ دوای گۆڕانی تارکن، دوایین پاشای ڕۆمانی لە ساڵی ٥١٠ پ. ز) دەستپێدەکات و لەساڵی ٢٧ پ.ز لەگەڵ دامەزراندنی ئیمپراتۆڕیای ڕۆمانی و لەنێوچوونی دەوڵەتە شارەکاندا کۆتایی دێت. ئەمە، سەردەمێکە کە تێیدا ڕۆما لە ناوچەی دەریای ناوەڕاستدا پایەیەکی زاڵ وەدەست دێنێت و لە ڕووی سیاسی و کارگێڕییەوە دەوڵەمەندتر دەبێت. بەڵام ئەوەی بەراستی لەم سەردەمەی مێژووی ڕۆمادا سەرنجی ماکیاڤێللی بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، ئەو ئەزموونە سیاسییەیە کە شیانی سەرهەڵدان و پتەوبوونی کۆماری لە ڕۆمادا دێنێتەکایەوە. ئەو ئەم ئەزموونە سیاسییە لە کتێبی **گوتارەکان**دا بە وردی و قووڵی تاوتۆ دەکات. ئامانجی ئەو لە تاوتۆکردنی شێوەی کاری پیاوانی دەوڵەت و دامەزراوەکانی کۆماری ڕۆما و ئەو ئەنجامانەی کە دەتوانین لەم



ئەزموونە سیاسییە وەدەست بهێنن، ئەوەیە کە سەرنجی هاوچاخانی خۆی بۆ لای چارەنووسی کۆماری فلۆڕەنسا ڕابکێشێت، و «ئەم کارە پێویستی بەوەیە کە ماکیاڤێللی بەردەوام لە ڕۆڵی کۆماری ڕۆمەوە بازبداتە سەر ڕۆڵی کۆماری فلۆڕەنسا و هەمیشە هزری لە نێوان جەمسەری "سەردەمی کۆن" و "سەردەمی نوێ" لە هات و چۆدا بێت»[١٧]. تاکە پرسیارێک کە ماکیاڤێللی هەوڵدەدات، لە ڕێی بیرکردنەوەکانی لە بارەی کۆماری ڕۆمەوە وەڵامی بداتەوە، ئەو مەسەلەیە کە لە کتێبی میردا لەمەڕ لۆژیکی دەسەڵات باسی لێوە دەکات. ماکیاڤێللی، لە ڕێی ئەو بابەتانەی کە لە کتێبی میردا دەیانخاتەڕوو، بۆ ناوەندی بڕیاردانی سیاسی واتە کەشوهەوای پێویست بۆ دەستەمۆکردن و پاراستنی دەسەڵات ڕێنماییمان دەکات. هەر لەبەر ئەوە دەتوانین ئەم کتێبە زێتر وەک نامەیەک لەبارەی هونەری سەرکەوتن لە سیاسەتدا لە قەڵەم بدەین نەک نامەیەک لەبارەی چۆنیەتی هونەری سیاسەت، چونکە هەر چەشنە سەرکەوتنێک لە هونەری سیاسەتدا، بە دەستەواژەیەکی دیکە، هەر چەشنە سەرکەوتنێک کە بۆ هێنانەکایەی دەزگایەکی سیاسی بێتە ئاراوە بەزەروورەت بەرهەمی هەنگاوگەلێکە کە بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات ئەنجام دەدرێت. بە بڕوای ماکیاڤێللی، چەسپاندنی واقعی دەوڵەت، نیشانەی سەرکەوتنە لە هێنانەدی دەزگای سیاسیدا. کەواتە هێنانەدیی دەوڵەت ئەنجامی چالاکییەکی سیاسیی ئەوتۆیە کە مەبەستەکەی وەدەستهێنانی دەسەڵات و پاراستنیەتی. بەدەستەواژەیەکی دیکە، ئامانجی سیاسەت وەدەستهێنان و پاراستنی دەوڵەتە، چونکە سیاسەتوان تەنیا لە ڕێی کەڵک وەرگرتن لەم

دامەزراوەیە دەتوانێت دەسەڵات پیادەبکات؛ مەرجی بەردەوامبوونی پیادەکردنی دەسەڵات لەلایەن سیاسەتوانەوە ئەوەیە کە دەوڵەت بتوانێت هاوسەنگییەک لە نێوان خۆی و خەڵکدا بهێنێتەکایەوە. سەقامگیربوون و بووژانەوەی دەوڵەت، پێویستی بە هێنانەکایەی ئاسایش و دابینکردنی خۆشگوزەرانی هەیە. کەواتە سیاسەتوان "پێویستە رێگەیەکی وابگرێتەبەر کە هاووڵاتییەکانی هەمیشە و لە هەموو بارێکدا پشت بە خۆی و حکوومەتەکەی ببەستن و ئەوکات هەمیشە وەفاو دڵسۆزییان بۆی دەبێت.[18]

دڵسۆزیی میللەت تەنیا یەکێکە لە مەرجەکانی پاراستنی حکوومەت. مەرجێکی دیکە، دەسەڵاتی بڕیاردان و بوێری سیاسەتوانە لە بەرانبەر ئەو کێشە و رووداوانەی کە هەڕەشە لە مانەوەی حکوومەت دەکەن. کەواتە لەسەر سیاسەتوان پێویستە لە رێی بەکارهێنانی دەسەڵاتی پێویست بۆ پاراستنی سیستمی سیاسی، رێگە نەدات رق و کینەی خەڵک لە بەرانبەریدا بورووژێت. "پێویستە ئەو، هەم دەست بەسەری خەڵکدا بێنێ و هەم هیچکات رێگە نەدات بارودۆخێکی وا سەرهەڵبدات کە خەڵک لە بەرانبەر ئەم دووڕیانەدا بوەستن کە: یان خۆیان بەدەست مردنەوە بدەن یان حکوومەت لەناوبەرن"[19]. ئەمە وانەیەکە ماکیاڤیللی لە ئەزموونی سیاسی- ئایینیی قەشەی فلۆرەنسا بە ناوی فراجیرۆ لامۆ ساڤۆنارۆلا فێری بووە. ئەم قەشەیە پەیڕەوی تاقمی دۆمینیکان بوو کە بەهۆی سوودوەرگرتن لەو دەرفەتەی کە لە ئەنجامی هێرشی شارلی هەشتەم و راکردنی پەییرۆی دووەم (لە بنەماڵەی مەدیچی) کە لە ساڵی ١٤٩٤ هاتەئاراوە، لە فلۆرەنسا دەسەڵاتی گرتە دەست و بە یارمەتیی خەڵکی ئەو شارە "کۆماری عیسا"ی دامەزراند، بەڵام یەکگرتنی لەگەڵ



فەڕەنساییەکان و پەیوەندی پچڕاندنی لەگەڵ پاپا بووە هۆی لەناوچوونی، چونکە بە کشانەوەی هێزە فەڕەنساییەکان لە ساڵی ١٤٩٧ و هاتنە سەرکاری پاپا ئەلکسەندەری شەشەم، ساڤۆنارۆلا بووە "پێغەمبەرێکی بێ چەک". دوای دەرچوونی حوکمی تەکفیرکردنی لەلایەن پاپاوە، لە نۆی ئاداری ١٤٩٨ خەڵکی فلۆرەنسا پشتیان تێکرد و سەرەنجام لە ٢٤ی مانگی مایسی ١٤٩٨ بە زیندوویی خستیانە ناو ئاگر و سووتاندیان.

ماکیاڤیللی لە کاتی حوکمدانی ساڤۆنارۆلا تەمەنی ٢٩ ساڵ بوو و لە رێکەوتی ١٨ی حوزەیرانی ١٤٩٨دا بۆ پۆستی دیوانی دووەمی کۆماری فلۆرەنسا دیارکرابوو. گێڕانەوەی چیرۆکی ساڤۆنارۆلا لەلایەن ماکیاڤیللییەوە لە نامە ناودارەکەی بۆ ریکاردۆ بچی باڵیۆزی فلۆرەنسا لە کۆشکی پاپادا- کە لە ٨ی ئاداری ١٤٩٨ دا نووسیویەتی- بەرچاو دەکەوێت. ئەو لەم نامەیەدا، راپۆرتێکی تێروتەسەل لەبارەی بیروڕا و ئامۆژگارییەکانی ئەم قەشەیە پێشکەش دەکات. بەڵام لە کتێبی میردا، ماکیاڤیللی ئەو وانانە دەردەبڕێت کە لەم رووداوەوە فێریان بووە. ئەو بەم شێوەیە دەنووسێت: "وەک لە رۆژگاری خۆماندا چارەنووسی فراجیرۆ لامۆ ساڤۆنارۆلامان بینی، لەبەر ئەوەی بڕوای خەڵک پێی رووەو سستی رۆیشت، ئەو و سیستمە تازەکەشی ژێرو ژوور بوون، هەروەها ئەو نە ئامرازێکی هەیە بۆ هێشتنەوەی بڕوای خەڵک بە خۆی، نە رێگەیەک بۆ بڕواپێهێنانی نابڕواداران... هەر لەو رووەوە گشت پێغەمبەرە چەکدارەکان سەرکەوتن و پێغەمبەرانی بێ چەکیش شکستیان هێنا"[20].

ماکیاڤیللی بە رێزگرتنێکی زۆرەوە، باسی ئەم "پێغەمبەرە بێ چەکە" واتە ساڤۆنارۆلا دەکات و لە کتێبی **گوتارەکان** دا دەڵێت: "ئەو- بێ ئەوەی

کارێکی شاز ئەنجام بدات- توانی خەڵکێکی زۆر ڕەگەڵ خۆی بخات"[21]، بەڵام لەگەڵ ئەم وەسفکردنەشدا، ماکیاڤیللی هەم باس لە زیرەکیی ئەم قەشەیە دەکات و هەم لەبارەی پلەوپایەخوازیی ئەو- کە کاریکردە سەر چارەنووسەکەی و لەلایەن خەڵکەوە لە نرخ و ئیعتوباری خست[22] وتوویژ و دەمەتەقێ دەکات. بێ ئیعتوباربوونی ساڤۆنارۆلا بەهۆی هەڵەکانی خۆیەوە بوو، بەو واتایەی کە ئەو یاسایانەی کە خۆی دایهێنابوون خستنیە ژێر پێوە و ئەم کارە بووە هۆی ئەوەی ئیعتوباری خۆی لە دەست بدات. ماکیاڤیللی لەم ڕووداوەوە بەم ئەنجامە دەگات کە هیچ دامەزرێنەر و قانووندانەرێک بۆی نییە ئەو قانوونەی کە خۆی دایهێناوە بشکێنێت، چونکە بە هۆی شکاندنی ئەم قانوونەوە، ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ خەڵکدا بەستوویەتی دەشکێت و پشتیوانیی خەڵک لە دەست دەدات و ڕق و کینەی ئەوان بەرانبەر خۆی دەورووژێنێت. خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە "بۆ بەختەوەریی حکوومەتی کۆماری یان پاشایەتی، تەنیا ئەوە بەس نییە کە فەرمانڕەوایەک یان پاشا لە سەرانسەری ژیانی سیاسیی خۆیدا، ژیرانە حوکمڕانی لەسەر خەڵک بکات، بەڵکو پێویستە قانوونگەلێک دابهێنێت بۆ ئەوەی دوای مردنیشی ئەو دەوڵەتەی ئەو دایمەزراندووە بە سەقامگیری بمێنێتەوە."[23]

کەواتە، دەتوانین بڵێین هێزی هەر دەوڵەتێک بەندە بەو قانوونانەوە کە دایاندەڕێژێت. دەوڵەتێک کە بە دروستی بنیاتنراوە ئەو دەوڵەتەیە کە خاوەنی دەستوورگەلێکی دروست بێت. سەقامگیریی هەر دەوڵەتێک و ئاسایشی خەڵک- بە پێچەوانەی شوێنەواری وێرانکاری گەندەڵی و دیکتاتۆری- بە جێبەجێکردنی ئەم قانوونانەوە بەستراوەتەوە. بەواتایەکی دیکە، مانەوە و سەقامگیریی دەوڵەت، پێویستی بە هاتنەکایەی پەیمان و



گرێبەندێک لە نێوان حاکم و مەحکوماندا هەیە. بەڵام پێویستە ئەم خاڵەش زیادبکەین کە جێبەجێکردنی قانوونەکان، تاکە فاکتەری سەقامگیریی دەوڵەت نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە هێزی سەربازیشەوە هەیە. "سەربازی ئامادە، پتەوترین پشتیوانی دەوڵەتەکانن و بەبێ ئەوانە ناکرێ نە قانوونی پشتبەستوو بە بڕیاری عەقڵیمان هەبێت و نە دامەزراوەی سوودمەندیش"[24]. هەر لەبەر ئەمە ناسینی هونەری سیاسەت، بەبێ ناسینی هونەری جەنگ، بێ مانایە، و پیاوی سیاسی کەسێکە کە پیاوی جەنگیش بێت. بە بڕوای ماکیاڤیللی، دەسەڵاتی سیاسی و دەسەڵاتی سەربازی دەسەڵاتگەلێکی بەیەکەوە بەستراوەن: "کەواتە پێویستە میر هیچ ئامانجێکی لەپێش و هیچ فکرێکی لە مێشکدا نەبێت، جگە لە جەنگ و سامان و ڕێکخستن، و بێجگە لەوانە داوای هیچ شتێکی دیکە نەکات"[25]. ئەم وتەیە بەو واتایەیە کە کاری سیاسەت و کاری جەنگ، دوو ڕووی ڕاستییەکن، و ئەو ڕاستییەش، هەمان دەسەڵاتی دەوڵەتە. پێویستە هەموو دەوڵەتێک خاوەنی ستراتیژییەکی سەربازی بێت، بەو شێوەیەی کە هەر کارێکی جەنگی، بەهۆی بوونی ستراتیژییەکی سیاسییەوە جێبەجێ دەبێت. جەنگ، دیاردەیەکی سیاسی و سیاسەتیش وێنەیەکی جەنگە. کەواتە هەر لێکۆڵینەوەیەک کە لە بارەی هەلومەرجەکانی دامەزراندنی دەزگایەکی سیاسی ئەنجام دەدرێت، پێویستی بە بیرکردنەوە لە بارەی جەنگەوە هەیە. وتوویژ لەبارەی جەنگ، تەنیا لە ڕێی لێکۆڵینەوە لە سیاسەتەوە دەبێت. هونەری سیاسەت دەکەوێتە پێش هونەری جەنگەوە.

## بەشی یەکەم

"لە دەرەوەی  واقعەکانەوە گشت سیاسەتێک بێ نرخە"
شارل دیگۆل

## حەزکردن لە سیاسەت



سالّی ١٥١٣ بوو و ماکیاڤیللی- لە مالّەکەیدا لە سان کاچییانۆ نووسینی کتێبی میری کۆتایی پێهێنا. ئەو دوای چواردە  سالّ خزمەتی دلّسۆزانە بۆ کۆماری فلۆرەنسا لە ٧ی تشرینی  دووەمی ١٥١٢دا، لە کار لادرا و خانەنشین کرا. خزمەتەکەی لە ١٨ی حوزەیرانی ١٤٩٨ لە تەمەنی ٢٩ سالّیدا وەک سەرۆکی دیوانی دووەمی کۆماری فلۆرەنسا دەستپێکرد. ماکیاڤیللی لە سەرانسەری ماوەی خزمەتەکەیدا تەنیا ئامانجێکی هەبوو: ئەویش خزمەتکردنی کۆمار بوو. ئەو لە جێبەجێکردنی ئەم مەبەستە دەریخست کە کارگێڕێکی زیرەک و پیاوێکی جێی متمانەیە. بە لەبەرچاوگرتنی ئازایەتی و تیژبینییەکەی لە ساتەوەختە سەختەکاندا، دەتوانین بلّێین ماکیاڤیللی نموونەیەکی بالاّی پیاوی سیاسییە. ماکیاڤیللی لەو ئۆپەراسیۆنانەدا بەشداربوو کە بۆ گەمارۆدانی شاری پیزا ئەنجام درا و بۆ جێبەجێکردنی کاروبارە سیاسییەکان چوار جار بۆ دیوانی لویسی دوازدەهەمی پاشای فەرەنساو دووجار بۆ دیوانی ماکسیمیلیان لەئەلّمانیاو دووجاریش بۆ دیوانی لوکرس بورجا نێردرا. لەسالّی ١٥٠٣دا بۆ بەشداریکردن لە ڕێورەسمی بەخاک سپاردنی پاپاکپی"ی سێیەم و هەلّبژاردنی پاپای نوێ، سەردانی ڕۆمای کرد. بەکورتی ماکیاڤیللی وەک سیاسەتوانێکی  بەئەزموون ناسرابوو و تا کۆتایی

ژیانی کارگێڕیی خۆی دڵسۆزیی بۆ بەڵێنەکانی خۆی لە بەرانبەر کۆماری فلۆرەنسادا نیشانداو هەر لەبەر ئەم دڵسۆزی و وەفادارییەش بوو کە خانەنشینی و زیندانی و ئەشکەنجەو دوورخستنەوەی بینی. بەڵام دەرکرانی لە دونیای سیاسەتدا زیاتر زیانی پێگەیاند لەو سێ هەفتەیەی کە رەوانەی زیندان کرا و ئەو ئەشکەنجەو ئازارانەی چەشتی.

ماکیاڤیللی، لەنامەیەکدا کەلە ١٣ی ئاداری ١٥١٣دا بۆ فرانچسکۆ ڤیتۆری دەنووسێت، باس لە ئازایەتیی خۆی لەبەرانبەر ئەم مەینەتییانە دەکات و گاڵتە بە ئەشکەنجەدان دەکات. ئەو دەنووسێت: "من ئەشکەنجەم بەو ئازایەتییەوە تەحەممول کرد کە پێویستە دەستخۆشی لەخۆم بکەم، پێم وایە بەنرخترم لەوەی کە پێشتر بۆی دەچووم"[٢٦]. بەڵام هەر ئەو، لە نامەیەکی دیکەدا کە لە رێکەوتی ١٠ی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا بۆ هەمان کەس نووسیبووی، بەهۆی دووریی لە دنیای سیاسەتەوە، زۆر پەرێشانە و دەڵێت: "هەست دەکەم تەمەنم بەفیرۆ دەڕوات، ئەم بارودۆخە ناکرێ بەردەوام بێت؛ چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی سەرەنجام من دووچاری دەستکورتی ببمەوە و بەر نەفرەت بکەوم. جگە لەوەش زۆرم حەز لێیە مەدیچییەکان بڕیاربدەن و ئەگەر [تەنیا] بۆ هاویشتنی بەردیش بێت- بۆ خزمەتکردن بانگم بکەن، ئەگەر نەمتوانی سەرنجیان بۆلای خۆم رابکێشمەوە، تەنیا خۆم بە بەرپرسیار دەزانم... پێویستە هەموو کەسێک بەدڵ و بەگیان حەز بکات پیاوێکی ئەوەندە بەئەزموون- ئەزموونگەلێک کە کەس کەمترین خەرجیی لە پێناویدا نەکێشاوە- خزمەتی بکات. سەبارەت بەراستگۆیی من نابێ کەمترین گومان هەبێت. من هەمیشە دڵسۆز بوویمە و



ئێستاش بەپێچەوانەی ئەمە ناجووڵێمەوە؛ کەسێک کە هەمیشە لە خزمەتکردندا دڵسۆز بووە، لەچل وسێ ساڵیدا - کە تەمەنی منە - ناتوانێت سروشتی خۆی بگۆڕێت. جگە لەوەش، هەژاریی من گەواهییە بۆ سەلماندنی ئەم قسەیە"[٢٧].

لەم گوتەیەدا دەبینین ماکیاڤیللی چەند بە پەرۆشە بۆ بەدەستهێنانەوەی چالاکییە سیاسییەکانی خۆی و هیوا دەخوازێت مەدیچییەکان رای خۆیان سەبارەت بەو بگۆڕن، بەڵام ئەو ماوەیەکی زۆر بەو ئومێدەوە دەژیا، و بۆ ئەوەی تەحەممولی رۆژگار بکات، گشت کاتەکانی خۆی بەخوێندنەوە و نووسینەوە بەسەر دەبرد. لە نێوان ئەو کتێبانەی کە ئەو حەزی لێ دەکردن دەتوانین ناوی بەرهەمەکانی دانتێ، پترارک، تیبۆل و ئۆڤید بەرین. ماکیاڤیللی رۆژی لەناو دارستانەکاندا بە خوێندنەوەی ئەم کتێبانە بەسەر دەبرد، بە شەوانیش، کاتێک دەگەڕایەوە ماڵەوە، جلوبەرگی کەشخە و جوان و رێک و پێکی لەبەر دەکرد و خۆی بۆ دیداری دۆستان ئامادە دەکرد، یان هەڵدەستا بە دیراسەکردنی بیروڕای هۆشمەند و بیریارە گەورەکانی سەردەمی کۆن. لەو بارەوە بەم شێوەیە دەنووسێت: "ئەوان بە رووخۆشییەوە پێشوازیم لێ دەکەن و لەو خواردنانەی کە ئامادەیان کردووە-ئەو خواردنانەی کە لەگەڵ زەوقی مندا دەگونجێن و من بۆ خواردنیان لەدایک بوومە- بەشم دەبێت. لە وتووێژکردن لەگەڵیاندا، و پرسیارکردن لە مەبەست و کارەکانیان، بەهیچ شێوەیەک شەرم ناکەم، و ئەوانیش وەک مرۆڤدۆستێک، وەڵامم دەدەنەوە. ماوەی چوار کاتژمێر هەست بە کەمترین ماندووبوون ناکەم، و گشت نیگەرانییەکانم لەبیر خۆم دەبەمەوە، نە لە فکری هەژاری دام و نە لە

مردن دەترسم. وەک دانتێ دەڵێ: ئەگەر ئەوەی لێی تێگەیشتووین بە زەینی نەسپێرین، هیچ زانستێک بوونی نابێت. من لە وتووێژکردن لەگەڵ ئەوانەدا، ئەوەی بە سەرەکیم زانیوە یادداشتم کردووە و نامەیەکم بە ناوی **حکوومەتە پاشایەتییەکان** نووسیوە. من لەم نامەیەدا، بە باشترین شێوە لە کێشەگەلێکدا کە لەم بارەیەوە باسیان لێوە دەکرێت (وەک: فەرمانڕەوایی چییە؟ چەند جۆری هەیە؟ چۆن دەتوانین وەدەستی بێنین؟ چۆن دەتوانین پارێزگاری لێبکەین؟ چۆن لەدەست دەچێت؟) ڕۆچووومە"[28].

پێویستە ئەم نامەیە بە گوتاری ڕاستگۆیانەی نووسەر لە بارەی قۆناغی دروستبوونی بەرهەمەکانی لەقەڵەم بدەین؛ چونکە تەنیا چەند مانگێک دوای دانانی ئەوەی لە ماوەی چواردە ساڵ چالاکی لە دونیای سیاسەتدا فێری بووە، لە شێوەی نووسیندا دەریدەخات. بەڵام پەلەپەلی ئەو بۆ ئەوەی کتێبی میر لە کەمترین ماوەدا بنووسێت، کاریگەریی لەسەر کاری بڵاوکردنەوەیدا نەبوو؛ چونکە ئەم کتێبە بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٥٣٢دا –واتە پێنج ساڵ دوای مردنی ماکیاڤیللی– بڵاوکرایەوە. هەروەها، داواکارییەکەی لە ڤیتۆری، بۆ ئەوەی ئابڕووی سیاسیی بۆ بگێڕێتەوە و دیسانەوە بۆ خزمەتکردن لە دەزگای ئیداریی کۆماری فلۆرەنسا بانگهێشت بکرێت، تا ساڵی١٥١٨ پەسند نەکرا و هەر لەهەمان ساڵدا بوو کە ڕێگەیان پێدا بگەڕێتەوە فلۆرەنسا؛ ساڵێک دوای گەڕانەوەی، بانگهێشتیان کرد بۆ کۆشکی مەدیچی و کاردینال یۆلیۆس دی مەدیچی داوای لێکرد لەبەرانبەر کرێی بە بڕی سەد فلۆرن لەساڵێکدا، مێژووی فلۆرەنسا بنووسێتەوە. ماکیاڤیللی سوودی لەم دەرفەتە وەرگرت بۆ ئەوەی توانای خۆی لە بواری



مێژوونووسی و شیکردنەوە سیاسییەکاندا پیشان بدات. ئەو توانی لەم ڕێگەیەوە، دیسان متمانەی بنەماڵەی مەدیچی بەو رادەیە بۆ خۆی رابکێشێت کە دوای هەڵبژاردنی یۆلیۆس دی مەدیچی وەک پاپا کلیمانی حەوتەم لەساڵی ١٥١٢ و تەواوبوونی نووسینی مێژووی فلۆرەنسا، ئەویان بۆ ڕۆما بانگێشت کرد. بەڵام کاتێک ماکیاڤیللی لە ساڵی ١٥٢٥ گەیشتە ڕۆما، بەهۆی سەرکەوتنی ئیمپراتۆر شارکلن و بەزینی فەرەنسا لە شەڕی "پاوی"، رەوشێکی قەیراناوی سەریهەڵدا. ماکیاڤیللی لە بەرانبەر گەورەیی و کاریگەری مەترسییەکە، پێشنیاری ئەوەی بۆ پاپا کرد کە شاری فلۆرەنسا قایم بکات و ڕێکخراوێک لە پارتیزانە نەتەوەییەکان لە ناوچەی ڕۆمانیا دابمەزرێنێت. پاپا پێشنیارەکەی پەسند کرد. بەڵام داوای بۆچوونی فرانچسکۆ گی چیاردینی حاکمی ڕۆمانیای کرد و ئەویش بە بەهانەی دەستگرتنەوە لە خەرجییەکان بەم پێشنیارە ڕازی نەبوو. لەئەنجامدا دوای ساڵێک واتە لە چواری نیسانی ١٥٢٩دا پاپا پێشنیارەکەی ماکیاڤیللیی جێبەجێ کرد، بەڵام ئەو کاتە ئیتر درەنگ بوو. هەڵە ستراتیژییەکانی چەکدارانی پاپا و سیاسەتە نادروستەکانی کلیمانی حەوتەم بوونە هۆی ئەوەی لە ئەیلولی ١٥٢٦دا ڕۆما شکست بخوات. پاپا لە کۆشکی سێنت ئانجلۆ بەندکرا و ناچار ئاگربەستی ڕاگەیاند. لەم ماوەیەدا ماکیاڤیللی، لە پاڵ گی چیاردینی هەوڵی ڕێکخستنی بەرگریکردن لە فلۆرەنسای دەدا. لە بەهاری ساڵی ١٥٢٧دا، چەکدارانی ئیمپراتۆر خۆیان بۆ هێرش ئامادە کرد. لە ڕێکەوتی ١٦ی مانگی مایسی ١٥٢٧ حکوومەتی مەدیچییەکان گۆڕا و ڕژێمی کۆماری سەرلەنوێ دامەزرایەوە. لەو کاتەدا ماکیاڤیللی تەمەنی ٥٨ ساڵ بوو و زۆر نەخۆش بوو، بەڵام وێڕای پیری و

نەخۆشییەکەی، لەبەر حەزکردنی لە سیاسەت و خواستی خزمەتکردن بە وڵاتەکەی، تەختەخەوی بەجێ هێشت و بەختی خۆی بۆ وەرگرتنی پلەی سکرتێری لە دەزگای حکوومەتی نوێی فلۆرەنسادا تاقی کردەوە. بەڵام شوورا دە کەسییەکە پێشنیاری ئەویان پەسند نەکرد و ئەمەش لێدانێکی کوشندە بوو لە جەستەی نەخۆشی ماکیاڤیللی. دوازدە رۆژ دوای ئەم رێکەوتە، واتە لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٥٢٧دا، ماکیاڤیللی لە نێوان ئەندامانی خێزان و هەڤاڵانیدا، لە خانووی خۆی لە ئۆلتەر ئارنۆ مرد و رۆژی دواتر، سەرەرای رازینەبوونی قەشەکان لە کلێسای سانتا کروچە بە خاک سپێردرا. بە مردنی ماکیاڤیللی یەکێک لە پیاوە گەورەکانی بیری سیاسیی نوێ لە ناوچوو. بەڵام لەراستیدا لەگەڵ کۆتایی هاتنی ژیانی ئەم پسپۆرەی هونەری سیاسەت، هونەری سیاسەت دەست پێ دەکات و لە خۆشەویستیی ئەوەوە بۆ سیاسەت پسپۆری نوێی هونەری سیاسەت لە دایک دەبن.

## بەشی دووەم

"میر لە هەموو شوێنێکدا هەیە و هەمووکەس دەتوانێت ببێتە میر"
ژان ژیونۆ

## کتێبی میر یان لۆژیکی دەسەڵات



گرامشی لەبارەی کتێبی میرەوە بەم شێوەیە دەنووسێت: "تایبەتمەندیی سەرەکیی ئەم کتێبە ئەوەیە کە کتێبێکی زیندووە"[٢٩]. ئەگەر ئەم کتێبە نەک تەنیا وەک وانەیەک لەبارەی ریالیزمی سیاسی، بەڵکو وەک کۆمەڵێک ئەزموونی سیاسی- مێژوویی سیاسەتوانێکی گەورە لەقەڵەمی بدەین، راستیی گوتەکەی گرامشیمان بۆ دەردەکەوێت، بێگومان هەر ئەم لایەنەیە کە گرنگیی سیاسی- مێژوویی ئەم کتێبە دەردەخات. بەڵام کتێبی میر، وەک کتێبێک لەبارەی شێوەی کاری فەرمانڕەوا فێڵباز و ستەمکارەکان، یان وەک فەیلەسووفێکی ناودار دەڵێت: "بە پەیڕەو و پڕۆگرامی دزە گەورەکان" ناوبانگی دەرکردووە. ئەم ناوبانگە خراپە لەبەر ئەوە نییە کە ستەمکارەکان دەیخوێننەوە و دەیکەن بە سەرمەشقی کردارەکانیان*، بەڵکو لە راستیدا، ئەنجامی ستەمێکەوە بەهۆی نەزانینەوە یەخەگیری گشت بەرهەمە گەورەکان دەبێتەوە، بەرهەمگەلێک کە لە هەنگاوە سەرەتاییەکانی فیکر و عەقڵ بەولاوەتر دەچن. بۆیە؛ هەرکەس کتێبی میر بخوێنێتەوە، بێگومان لەو حوکمەی کە بەسەر ماکیاڤیللی و بەرهەمەکەی داوە پاشگەزدەبێتەوە و چاوی پێدا دەخشێنێتەوە، و

* مۆسۆلینی دانەیەک لەم کتێبەی، کە خۆی پێشەکیی بۆ نووسیبوو، بۆ هیتلەر نارد.

لەوە بە دواوە وەک ڕێنماییکەری ستەمکاران سەیری ناکات، بەڵکو هەر کە پەی بە بەهای ڕاستەقینەی ئەم کتێبە برد، وەک نامەیەکی کورت لە بارەی فەلسەفەی سیاسی سەیری دەکات. کتێبی **میر** لە بیست و شەش بەش پێکهاتووە کە هەمووی باسی مەسەلەی دامەزراندنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا و پاراستنی دەکەن. لەم کتێبەدا ستایشی هیچ فەرمانڕەوایەک نەکراوە، بەڵکو نووسەر هەوڵدەدات لە سەرچاوە و هەلومەرج و سنووری دەوڵەت و دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بکۆڵێتەوە؛ هەر لەبەر ئەوەشە، ئەو ناونیشانەی کە لە بنەڕەتدا بۆ کتێبەکەی هەڵبژاردووە، بریتییە لە حکومەتە پاشایەتییەکان نەک میر، بەڵام ناونیشانی کتێبەکە، دوای مردنی ماکیاڤیللی و لە کاتی بڵاوکردنەوەیدا گۆڕا. بەڵام بۆچی ماکیاڤیللی ناونیشانی "حکوومەتە پاشایەتییەکان"ی بۆ کتێبەکەی هەڵدەبژێرێت؟ هۆیەکەی ئەوەیە کە هەوڵدەدات جۆرە جیاجیاکانی حکوومەت شیبکاتەوە. کاتێک ماکیاڤیللی دەستی دایە نووسینی ئەم کتێبە، ماوەیەک بوو کاری لەسەر کتێبی **گوتارەکان** دەکرد. بەڵام ڕووداوەکانی ڕۆژگار دەبنە هۆی ئەوەی کاری کتێبی دووەم بخاتە لاوە و بەپەلە دەست بە نووسینی میر بکات. بەڵام ئەم پەلەپەلە نابێتە هۆی ئەوەی واز لە بابەتەکانی لێکۆڵینەوەی خۆی لە کتێبی **گوتارەکان** بێنێت و لە کتێبی **میردا** بچێتە سەر بابەتێکی دیکە. لە ڕاستیدا لە کتێبی **گوتارەکان** و **میردا** ڕووبەڕووی یەک کێشە دەبینەوە کە لە دوو ڕوانگەی جیاوازەوە خراوەتەڕوو. بە دەستەواژەیەکی دیکە، ئێمە لەم دوو کتێبەدا، دوو جۆر چەسپاندنی کردەیی یەک تیۆر دەبینین، ئەو تیۆرەش، تیۆری دەوڵەتە. بەم شێوەیە، ماکیاڤیللی، تیۆری دەسەڵات لە ڕووی



پیادەکردنی لەلایەن دەوڵەتەوە دەخاتەڕوو؛ هەر جارەی باسی دەسەڵات دەکات، مەبەستی پیادەکردنی دەسەڵاتە لەلایەن دەوڵەتەوە. بەڵام بە ڕای ماکیاڤیللی، دەسەڵاتی دەوڵەت وەک "دەسەڵاتی سیاسیی ناتاکەکەسی" خۆی دەرناخات. دەسەڵاتی سیاسی، خودێکی ژیر (عاقڵ)ی دەوڵەت نییە، بەڵکو لە پەیوەندیی نێوان باڵادەستیی (Authority) کەسی سیاسەتوان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. کەواتە، لێرەدا، مەسەلەی "گشتێتی دەوڵەت" تەنانەت کاتێک کە پەیوەندی نێوان بونیادی سیاسی و بونیادی کۆمەڵایەتی، بەهۆی کردارەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتیشەوە دەستنیشان بکرێت، باسی لێوە ناکرێت. بە ڕای ماکیاڤیللی، بونیادی دەوڵەت، بەهۆی چالاکیی سیاسیی "دامەزرێنەر- قانووندانەر"ەوە سنووردار دەکرێت، و مانەوەی دەوڵەت، بە کارە سیاسییە بەردەوامەکانی فەرمانڕەواوە بەستراوەتەوە. هەر لەبەر ئەوە، دەوڵەت تەنیا ئەو کاتە بە سیمای یەکبوونی سیاسی لە قەڵەم دەدرێت، کە پێکهاتەی دەسەڵاتەکەی لە کارەکانی سەرۆکی دەوڵەتدا بەرجەستە ببێت. لەم ڕووەوە، تەنیا، وەک "دامەزرێنەری فەرمانڕەوایی" کە لەلایەن فەرمانڕەواوە هاتۆتەکایەوە، دەتوانین باس لە دەسەڵاتی دەوڵەت بکەین، ئەمەش لە کاتێکدا کە ستراتیژیی دەوڵەت لەگەڵ ستراتیژیی فەرمانڕەوا یەک بێت. کەواتە بوونی دەوڵەت تەنیا لە ڕێی باڵادەستیی فەرمانڕەواوە دەشێ هەست پێ بکرێ. لە ڕەوشێکی ئەوتۆدا دەوڵەت، وەک پشتیوانی دەسەڵاتی سیاسی، خۆی دەنوێنێت. بەڵام واقعی جەوهەریی ئەم دەسەڵاتە سیاسییە، لەسەر بنچینەی باڵادەستی بەسەر بوارێکی دیاریکراو دامەزراوە. هەر دامەزراوێکی دەسەڵاتی

سیاسی، بەرهەمی راستەوخۆی باڵادەستییە بەسەر ئەم بوارەدا، هەروەها بۆ مەبەستی پیادەکردنی باڵادەستییە بەسەر گروپێکی کۆمەڵایەتیدا. لەو بارەوە، دەسەڵاتی تاکەکەسی، وەک دامەزراوێکی دەوڵەتی کاردەکات. پێویستە ئەم دامەزراوە دەوڵەتییە، بەپێی سروشتی ئەو دەسەڵاتەی کە رەنگی پێدەداتەوە، بە چوارچێوەیەکی سیاسی لەقەڵەم بدرێت. بەدەستەواژەیەکی دیکە، دەوڵەت بوارێکە کە تێیدا، دەسەڵاتی ئەو کەسانەی فەرمانڕەوایی بەسەر خەڵکدا دەکەن، پیادە دەکرێت. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین دەوڵەت، واتە گۆڕانی دەسەڵات بۆ دامەزراوێک، بە مەبەستی پارێزگاری لێکردنی. بۆیە هەموو دەسەڵاتێک تەنیا ئەو کاتە شەرعییە کە سەقامگیر بێت. بەپێی بیروڕای سیاسیی ماکیاڤیللی، ئەرکی دەوڵەت ئەوەیە کە چاودێری هاوسەنگیی ئەندامەکانی پەیکەری سیاسی بکات. چونکە، سەرەڕای ئەوەی کە دەسەڵات، بۆ چەسپاندنی شەرعییەت و بەردەوامیی فەرمانڕەوایی خۆی، سوود لە دەزگای دەوڵەت وەردەگرێت، بەڵام پێویستە هەمیشە ئەو گۆڕانکارییانە هەڵسەنگێنێت کە لەوانەیە لەکایەی سیاسیدا سەرهەڵبدەن بۆ ئەوەی بتوانێت لەو دیاردانە ئاگاداربێت کە هەڕەشە لە ژیان و مانەوەی دەوڵەت دەکەن. هەر بۆیە، دەوڵەت، تەنیا دیمەنی باڵای دەسەڵات نییە، بەڵکو دامەزراوێکی قانوونیشە کە پێویستە چاودێری شێوەی جێبەجێکردنی قانوونەکان بکات. بە رای ماکیاڤیللی، دەوڵەت، پێش هەمووشتێک، دامەزراوێکی قانوونییە، واتە سیستمێکی قانوونییە. لەم دامەزراوە قانوونییەدا پیادەکردنی دەسەڵاتی سیاسی، بەهۆی قانوونەوە ئەنجام دەدرێت؛ هەروەها لە ئەنجامی پەیوەندیی نزیکی دەسەڵات بەقانوونەوە گشت کارێکی



سیاسی بە کارێکی قانوونیی لەقەڵەم دەدرێت. لەو ئەولەوییەتەی کە بە قانوون دەدرێت، جیاوازی نێوان کایەی تایبەتی و کایەی گشتی دەردەکەوێت. ئەم جیاوازییە وامان لێدەکات کە نەک تەنیا مانای پەیوەندیی نێوان قانوون و سیاسەت کە لە نێوان دەوڵەت و تاکەکەسانی تایبەتدا هەیە، دەستنیشان بکەین، بەڵکو سنووری رێکخستنی دەوڵەتیش روون بکەینەوە. لێرەدا ئێمە رووبەڕووی بنەمایەکی نوێ لەو بنەمایانە دەبینەوە کە پەیوەندییان بە سەقامگیریی سیاسییەوە هەیە کە پێویستە لەناو گۆڕانی سیستمی کۆندا بە دوای هەلومەرجی سەرهەڵدانیدا بگەڕێین، چونکە "لە ناو بووژانەوەی سیستمی دەوڵەتیدا، تۆی لێکداپچڕانی یەکێتی جیهان و لە دژیەک وەستانی دونیا و دوارۆژ خۆی حەشارداوە"[٣٠].

ئەم لە دژ وەستانە، هێز و توانای ئەوتۆ بە مرۆڤ دەبەخشێت کە خۆی بە سەرچاوەی کاروبارەکانی خۆی بزانێت. کەواتە پێویستە سروشتی مرۆڤ بە چەقی دەسەڵاتی سیاسی لەقەڵەم بدەین؛ هەروەها هەماهەنگیی نێوان کۆمەڵگای مرۆیی و دەسەڵاتی دەوڵەت لە ئەمەوە سەرچاوە دەگرێت. بەواتایەکی دی، کۆمەڵگا لەسەر بنچینەی مافی مرۆیی، نەک "مافی سەروو- کۆمەڵایەتی" بنیات دەنرێت. لە ئەنجامی دزەکردنی چەمکی "مافی مرۆیی" بۆ ناو واقعی سیاسی، یەکسەر چەمکی "دامەزراندنی دەوڵەت"یش دێتەئاراوە. دامەزراندنی دەوڵەتێک، واتە هێنانەکایەی هەلومەرجی پێوست بۆ پیادەکردنی دەسەڵات. بە خستنەڕووی ئەم مەسەلەیە، دەگەڕێینەوە بۆ خاڵی سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیە.

ماکیاڤیللی کێشەی دامەزراندنی دەوڵەت بە دوو شێوە دەخاتەڕوو: هەم لە ڕووی چەمکی "کایەی پاشایەتی" و هەم لە ڕووی "کایەی کۆماری"یەوە. ماکیاڤیللی هەوڵدەدات شێوازە جیاجیاکانی پیادەکردنی دەسەڵات روون بکاتەوە و بۆ هەرکێشەیەک ڕێگە چارەیەک پێشنیار بکات. بەڵام لەم دوو حاڵەتەدا، بنچینەی تیۆرە سیاسییەکەی لەسەر رەشبینی سەبارەت بە مرۆڤ دامەزراوە. بە رای ماکیاڤیللی، مرۆڤ بە سروشت ناپاکە و هەر لەبەر ئەمە پێویستی بە سیستمێکی سیاسی هەماهەنگ و سەقامگیر هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی بژیت. کەواتە لە مەسەلەی یەکبوونی سیستمی سیاسیدا، بەرژەوەندیی تاکەکان لە ئارادایە. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئاگاداربین کە ریالیزمی سیاسی ماکیاڤیللی، لە خۆشەویستیی ئەو بۆ ئیتاڵیا دانەبڕاوە. بیروڕا سیاسییەکانی دیمەنێکن لە نیگەرانیی لەمەڕ سەربەخۆیی و یەکپارچەیی و یەکێتیی ئیتاڵیا. لەبەر ئەمە، بیروڕا سیاسییەکانی ماکیاڤیللی لە جیهانبینیی ئەوەوە سەرچاوە ناگرن، بەڵکو سەرچاوەکەیان واقعە. بە بۆچوونی ئەو شێوازی سیاسەت، لە واقعی مرۆییەوە هەڵقوڵاوە. کەواتە پێویستە بڵێین بە بڕوای ماکیاڤیللی، چارەنووسی ئادەمیزاد لە دونیای سیاسەتدا "حەتمی" نییە و ناتوانین هیچ نیشانەیەک لە هاتنەدی "کۆمەڵگایەکی نموونەیی لە داهاتوودا" بەدی بکەین. ئەو پێی وایە لۆجیکی چالاکیی سیاسی بە پێی واقع دیاردەکرێت و لەوەوە سەرچاوە دەگرێت. کەواتە دەتوانین بڵێین ماکیاڤیللی بیرمەندێکی تەواو دژی "یۆتۆپیا" و "کۆمەڵگای نموونەیی"یە، چونکە: ئەو پەیوەندییەی کە ئەو لە نێوان کایەی سیاسەت و کایەی مێژوودا دروستی دەکات، هەموو جۆرە چەمکێکی "یۆتۆپیا" رەت



دەکاتەوە. کەواتە، بەو شێوەیەی کە لە بیرۆکەی کۆمەڵگای نموونەییدا دەبینین، ـهیچ چوارچێوەیەک بۆ مێژوو نییە و هەر لەبەر ئەمە دونیای سیاسەتیش دونیایەکی بەرتەسک نییە.

لەوەی تائێستا گوتمان دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە بە رای ماکیاڤیللی، رێکخستنی کۆمەڵگا تەنیا یەکجار و بۆ هەتاهەتایە ئەنجام نادرێت. بەپێی بڕوای ئەو، چالاکیی سیاسی هەم لایەنی "قانوونی داهێنراو"ی هەیە و هەم لایەنی مێژوویی. لەم ڕووەوە، هەر دوو کتێبی **میر** و **گوتارەکان**، کتێبێک نین کە لە روانگەی کۆمەڵگای نموونەییەوە نووسرابن و ئامانجیان نە روونکردنەوەی سیاسەتە لە کۆمەڵگای نموونەیی و نە گەڕانە بە دوای "بەهەشتی ون" و کۆمەڵگایەک کە نەخشەکەی پێشتر کێشراوە. لەبیری ماکیاڤیللیدا، رەخنەگرتن لە یۆتۆپیزم، لە رەتکردنەوەی بیرۆکەی گەڕانەوە بۆ کۆمەڵگاکانی سەردەمانی کۆن، جیا نییە. ئەوەی بەلای ئەوەوە گرنگە، کۆمەڵگایەکی سیاسییە کە ژیانی تێدا بەسەر دەبات، نەک بەڵێنی خۆشگوزەرانی و بەختەوەری لە داهاتوو لە "دوورگەی یۆتۆپیا"دا. هەر لەبەر ئەمە هەوڵدەدات یارمەتی لە میرێکی ئەوتۆ وەربگرێت کە لە روانگەی خۆیەوە ستەمکار نەبێت و بە دامەزرێنەر-قانووندانەرێکی نوێ لەقەڵەم بدرێت و بە یارمەتی ئەوەوە نەخشەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتوو بۆ سەرتاسەری ئیتاڵیا دابڕێژێت. بەڵام پێویستە ئەم میرە نوێیە چ بکات بۆ ئەوەی ئیتاڵیا لە ستەمکاری رزگار بکات و دەوڵەتێک دابمەزرێنێت کە قانوونگەلێکی پێویست پەسند بکات و رێزیان لێ بگرێت؟ ماکیاڤیللی لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێت پێویستە میرێکی ئاوەها بتوانێت هەم هونەرەکانی سیاسەت و

هەم هونەرەکانی جەنگ بە تەواوی بەکاربهێنێت. کەواتە ئەو، پێش وەدەستهێنانی حکوومەت و بۆ ئەوەی بتوانێت حکوومەتی خۆی بپارێزێت، پێویستە سەرچاوەی دەسەڵاتی خۆی بناسێت و بتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە: سەرچاوەی حوکمکردنی ئەو لەسەر ئەو ناوچە دیاریکراوەدا چییە [یان کێیە]؟ ماکیاڤیللی دەڵێت: "هەر یەک لە خەڵک و دەستڕۆیشتووەکان هەر کە دەرفەتیان بۆ رەخسا، میرێک بۆ خۆیان دادەمەزرێنن"[٣١]. بەدەستەواژەیەکی دی، دەسەڵاتی حکوومەت پشت بە یەکێک لەم دوو هێزە جیاوازانە دەبەستێت: یان خەڵک یان دەستڕۆیشتووان. بۆیە فەرمانڕەوا کەسێکە دەکەوێتە نێوان ئەم دوو کۆمەڵەوە؛ "چونکە هەرکاتەی دەستڕۆیشتووەکان بزانن لەگەڵ خەڵکدا ناگونجێن، یەکێک لە نێوان خۆیاندا هەڵدەبژێرن و دەیکەن بە میر بۆ ئەوەی لە پەنای دەسەڵاتی ئەودا بە داواکارییەکانی خۆیان بگەن. خەڵکیش هەر کات زانییان لەگەڵ دەستڕۆیشتووەکان هەڵناکەن، یەکێک لە نێوان خۆیان دیاردەکەن و بە پلەی میرایەتی دەگەیەنن تاکو لە سێبەریدا بحەسێنەوە"[٣٢]. لە هیچ یەک لەم دوو حاڵەتەدا، میر وەک تاکێکی تایبەت کارناکات بەڵکو رۆڵی پیاوی دەوڵەت دەبینێت، چونکە وەک نێوانگیرێک لە نێوان گرووپە کۆمەڵایەتییەکاندا، بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت دەکات. بەڵام بۆ دامەزراندنی دەوڵەت لە ناوچەیەکی دیاریکراودا، لەم دوو هێزە کامەیان پێویستترە: پارە و سامانی دەسەڵاتداران؟ یان رەزامەندیی خەڵک؟ بەرای ماکیاڤیللی "بێگومان خەڵک! چونکە داواکارییەکانی خەڵک لە هی دەستڕۆیشتووەکان ماقووڵترن..."[٣٣]. میر پێویستی بە خۆشەویستی و متمانەی خەڵکە بۆ ئەوەی بتوانێت دژی مەترسی و



دوژمنایەتییەکان بوەستێتەوە، لە کاتێکدا ئەگەر پشت بە دەسەڵاتداران ببەستێ ئەوا نەک تەنیا لە بەرانبەر تەنگوچەڵەمەکاندا بە تەنیا جێی دەهێڵن، بەڵکو ناتوانێت خۆشەویستیی خەڵک وەدەست بێنێت. کەواتە "خۆشەویستیی خەڵک بۆ میر پێویستە، دەنا لە رۆژگاری تەنگانەدا پشتوپەنای نابێت"[٣٤]. بەڵام میر بۆ راکێشانی خۆشەویستی خەڵک پێویستە "رەوشت بەرزی" بکاتە پیشە و بەو سیفەتەوە ناو دەربکات، بێ ئەوەی لەم رێگەیەدا زیادەڕۆیی بکات و بەم هۆیەوە نەکەوێتە بەر رق و نەفرەتەوە. بۆ وەدەستهێنانی ئەم ناوبانگە هەر ئەوەندە بەسە کە رێز لە خەڵک بگرێت، چونکە "خەڵک جگە لەوەی کە زۆرییان لێ نەکرێ شتێکی دیکەیان ناوێ"[٣٥]. بۆیە پێوستە میر خۆی لە تەماعکاری و تالانکردنی موڵک و ماڵی خەڵک و هەروەها قورسکردنی باری باجەکانیان بپارێزێت. ئەو "پێویستە رێگەیەکی وا بگرێتە بەر کە هاووڵاتییەکانی هەمیشە و لە هەموو حاڵەتەکاندا پشتیان بەو و بە دەوڵەتەکەیەوە گەرم بێت و ئەو کات هەمیشە دڵسۆزیی بۆ دەنوێنن"[٣٦]. بەهۆی وەدەستهێنانی متمانەی خەڵکەوە میر دەتوانێت دژی هێرشەکان بوەستێت. هەر لەبەر ئەمە، ماکیاڤیللی، پێ لەسەر رۆڵی خەڵک لە کاتی جەنگدا دادەگرێت. بە گوتەی ئەو پێویستە میر شوێنکەوتووانی خۆی خۆش بوێن بۆ ئەوەی بتوانێت لە جەنگاوەرە بەزۆرەملێ و کرێگرتەکان بێ منەت بێت، چونکە ئەمانە جگە لە خراپەکاری و زیان شتێکی دیکەیان لێناکەوێتەوە. هەر لەبەر ئەمە "ئەگەر کەسێک کاری بەرگریکردن لە وڵاتی خۆی بە سەربازە کرێگرتەکان بسپێرێت، هەرگیز ئارام و ئاسوودە نابێت، چونکە ئەوانە لێکدابڕاو و دەسەڵاتخواز و بەرەڵڵا و پەیمان شکێنن، لەگەڵ دۆستان

ئازان و لەبەرانبەر دوژمنانیش زەبوون..."[٣٧]. ماکیاڤیللی، پێشنیاری
ئەوە بۆ میر دەکات کە گەریلالای نەتەوەیی دابمەزرێنێت و جڵەوی
کاروبارەکانی بە سەربازە کرێگرتەکان و هاوپەیمانەکانیان نەسپێرێت.
بەم شێوەیە، میر، تا ئەو کاتەی خەڵک لێی بێزار نەبوونە دەتوانێت
پشتیان پێ ببەستێت و سەقامگیریی دەوڵەت بپارێزێت. بەڵام ئەگەر
میر رێز لە خەڵک نەگرێت ئەوانیش رێزی لێ نانێن. رێزگرتن
هەستێکە سەرچاوەکەی یان خۆشەویستییە یان ترس؛ "بەڵام لەبەر
ئەوەی هەبوونی ئەم دوو حاڵەتە بەیەکەوە زەحمەتە، ئەگەر بڕیار بێت
یەکێک لەو دووانە هەڵبژێرین، دەبێ بڵێین باشتروایە بترسێن نەک
خۆشیان بوێت"[٣٨]. بەڵام پێویستە سەرنج بدەین کە ماکیاڤیللی، دوای
ئەوەی داوا لە میر دەکات دڵی خەڵک بۆ خۆی راکێشێت، بۆچی داوای
ئەوەشی لێدەکات کە وا لە خەڵک بکات، لێی بترسێن؟ لە راستیدا، ئەو
خاڵەی ماکیاڤیللی داکۆکی لەسەر دەکات ئەوەیە کە میر نابێ بکەوێتە
بەر رق و نەفرەتی شوێنکەوتووانی. کەواتە، کاتێک کە ئەو هێشتا
نەکەوتۆتە بەر رق و نەفرەتی خەڵکەوە، ئەو ئامرازەی بۆ هێنانەکایەی
هەستی رێزگرتنی ئەوان بەرانبەر بە خۆی بەکاریدەهێنێت گرنگییەکی
ئەوتۆی نییە. "کەواتە پێویستە میری ژیر پشت بەو شتە ببەستێت کە
لەبەر دەستی خۆیدایە نەک ئەوەی لەبەر دەستی خەڵک، هەروەها
وەک گوتمان، تەنیا پێویستە خۆی لە رق هەڵساندن بپارێزێت"[٣٩]. جگە
لەمە، میر بۆ دروستکردنی سام لە ناو دڵی خەڵکدا، پێویستە بزانێت
چۆن دەتوانێت سوود هەم لە هێز و هەم لە قانوون وەربگرێت.
چونکە، لەو شوێنەی کە هێزی قانوون بەکار نەیەت، قانوونی هێز
حوکم دەکات. کەواتە، دەسەڵاتی میر تێکەڵێکە لە هێز و قانوون؛ لەم



روانگەیەوە دەتوانین بە بوونەوەرێکی نیمچە مرۆڤ و نیمچە ئاژەڵ لە
قەڵەمی بدەین. نیوەی مرۆڤە چونکە لە چوارچێوەی قانووندا ئیش
دەکات و نیوەی ئاژەڵە، چونکە لە بازنەی قانوون دەچێتە دەرەوە و
قاچ دەخاتە دونیای زۆرلێکردن و بە کارهێنانی هێزەوە. بە رای
ماکیاڤیللی، پێویستە میر لە نێو ئاژەڵاندا چاو هەم لە شێر و هەم لە
رێوی بکات. "چونکە شێر ناتوانێت لە داوەکان رابکات و رێویش
ناتوانێت لە دەستی گورگان قوتار بێت. لەو رووەوە، پێویستە رێوی
بین و دادۆزبین (داوەکان بناسین)و شێر بین و گورگەکان
راوبنێین"[٤٠]. فێڵبازیی رێوی و هێزی شێر، بەیەکەوە، وادەکەن میر لە
هەموو لایەنێکەوە بەهێز بێت. ئەوەی لێرەدا پێویستە لە گوتەکەی
ماکیاڤیللی هەڵبێنجین ئەوەیە کە میر رۆڵی ئاژەڵ دەگێڕێت بێ ئەوەی
ئاژەڵ بێت. هەروەها ئەوەی گرنگە ئەو وێنەیە کە دەسەڵات لە هزری
ئەوانی دیکەدا دەیهێنێتە ئاراوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە، لۆژیکی
رواڵەت دەبێتە بنچینە و بنەمای دادوەریکردنی ئەوانی دیکە. وەک
مێرلۆپۆنتی دەڵێ "مەرجی سەرەکیی سیاسەت ئەوەیە کە لە رووالەتدا
بەرجەستە ببێت"[٤١]. کەواتە جەوهەر و ناوەرۆکی سیاسەت ئەوەیە کە
رووخسارێکی دیار و بەرجەستەی هەبێت. چونکە ئەوەی بۆ دەسەڵات
گرنگە ئەوەیە کە هەمیشە، تەنانەت لە حاڵەتی لاوازیشدا، بە بەهێز
خۆی دەنوێنێ. لەبەر ئەوەی کە "خەڵک، بەگشتی، زێتر بەپێی ئەوەی
لەهێز بەرچاویان دەکەوێت، حوکم دەدەن نەک بە پێی ئەوەی دەتوانن
لە نزیکەوە دەستی لێبدەن، و هەمووان دەتوانن لە دوورەوە تۆ ببینن،
بەڵام کەم کەس دەتوانێت لە نزیکەوە دەستت لێ بدات"[٤٢].

بەرای ماکیاڤیللی، سیاسەت، زێتر لە قومارێک دەچێت کە هەریەک لە یاریکەرەکان هەوڵدەدات بەسەر ئەوی  دیکەیاندا سەربکەوێت، پارەی زێتر وەدەست بێنێت، و سوود لە گشت دەرفەتێک وەربگرێت بۆ کەمترکردنەوەی شانسی بردنەوەی لایەنی بەرانبەر. هەروەها بەرای ئەو، سیاسەت چالاکییەکە تەنیا مرۆڤەکان ئەنجامی دەدەن. سیاسەت، چالاکییەکە لە ئاستی رۆحی مرۆڤدا. لەگەڵ ئەمەشدا، ناتوانین سیاسەت وەک چالاکییەکی "کامڵبوو" لەقەڵەم بدەین، چونکە مرۆڤەکان کامڵ نین. کەواتە مەسەلەی "دەوڵەتی کامڵبوو" شیاوی باسکردن نییە. سوودی سیاسەت، هێنانەدی و پاراستنی یەکێتی و یەکپارچەیی سیستمێکی سیاسییە. بە رای ماکیاڤیللی، دەوڵەت، یەکێکە لە هۆکارە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگا، و ئامانجی سەرەکی و یەکەمی نووسەری کتێبی میر ئەوەیە کە جەوهەری گشتیی دەوڵەت دەستنیشان بکات؛ هەروەها کەمتر بە دوای دۆزینەوەی "چاکترین دەوڵەت"دا دەگەڕێت. بەدەستەواژەیەکی دس، کاتێک ماکیاڤیللی باس لەمەسەلەی جەوهەری دەوڵەت دەکات، مەبەستی مەسەلە ئەخلاقییەکان نییە. کەواتە دەتوانین هاودەنگ لەگەڵ ئالبێرتۆ مۆراڤیا بڵێین "ماکیاڤیللی، سیاسەت لە ئەخلاقی مەسیحی جیا دەکاتەوە"[٤٣]. ئەو لە رێی بەرتەسککردنەوەی بواری شتە پیرۆزەکان هەوڵدەدات لە چوارچێوەی کۆمەڵگادا ئەوەندی دەکرێ "واقعی کاروباری سیاسی" روون بکاتەوە. ئەو، رۆڵی کۆمەڵایەتی ئایینیش هەر لەم روانگەیەوە شەن و کەو دەکات. ماکیاڤیللی بە پێچەوانەی شوێنکەوتووانی بیروڕا سیاسییەکانی قەشە ئۆگۆستین کە ئایین بە ئامانجی گشت چالاکییە سیاسییەکان لەقەڵەم دەدات- بڕوای وابوو کە پێویستە سیاسەت ئامانجی چالاکییە



ئایینییەکان بێت. ماکیاڤیللی یەکێکە لە بیریارە سیاسییە یەکەمەکانی سەردەمی نوێگەری کە وەک ئامرازێک باس لە ئایین دەکات بۆ وەدەستهێنانی ئامانجی سیاسی، و "لە نێوان بیریارانی سەردەمی رێنسانسی ئیتاڵیا ماکیاڤیللی لە هەمووان زێتر لە کتێبی ئینجیلەوە دووره، لە دانتی کەمتر ئیمان تێکەڵ بە سیاسەت دەکات و لە هەمووان زێتر کەمتەرخەمە لە ئاست ئەخلاقی مەسیحیدا ، چونکە بە رای ئەو، ئەخلاقی مەسیحی بۆتە هۆی ئەوەی کە هاوچاخەکانی خواستی گەورەیان نەبێت"[٤٤]. ئامانجی ماکیاڤیللی ئەوەیە کە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و ئایین بەو شێوەیەی لە سەردەمی ئەودا هەبوو بگۆڕێت. بەڕای ئەو، پێویستە ئایین یارمەتی مرۆڤ بدات بۆ هێنانەدی کۆمەڵگایەکی بەختەوەر. هەر چەند پێی وابوو بابەتی راستەقینەی سیاسەت، مرۆڤە. لەگەڵ ئەوەشدا، ماکیاڤیللی جەختی لەسەر ئەو رۆڵە گرنگەی ئایین دەکردەوە کە لە پرۆسەی بنیاتنانی دەسەلاتدا هەیەتی؛ بەڵام لە کتێبی **گوتارەکان**دا لەو بارەوە دەدوێت و دەڵێت: "لە نێوان ئەو کەسانەی ستایشیان دەکرێت، کەس لە دامەزرێنەرانی ئایین بەناوبانگتر شک نابەین"[٤٥]؛ هەروەها دەڵێت: "ئەرکی قانوون و سەرکردەکانی کۆمار ئەوەیە کە رێز لە بنەما ئایینییەکان بگرن"[٤٦]. کەواتە بە رای ماکیاڤیللی، ئایین، یەکێکە لە هۆکارەکانی یەکپارچەیی کۆمەڵگا و سەقامگیریی دەوڵەت. ئایین، سیستمی کۆمەلایەتی رێکدەخات. هەر لەبەر ئەوەش، تا ئەو کاتەی بڕوابوون بە خوا دەستنیشانکەری لۆجیکی چالاکییە هاوبەشەکانی مرۆڤە، لە هونەری سیاسەتدا نابێ نرخێکی کەم بۆ ئایین دابنرێت. بەڵام لەوانەیە ئەم پرسیارە بکرێت کە ماکیاڤیللی تا چەند ئایینپەروەرە؟ لە وەڵامی ئەم

پرسیارەدا، بێگومان دەتوانین بڵێین کە کەسێکی خاوەن بڕوایە، بە
رای ئەو ئایین، رۆڵێکی سەرەکی لە پتەوکردنی کۆمەڵگاکاندا دەگێڕێت
و بەهایەکی مەدەنیی هەیە. کەواتە دەبینین ماکیاڤیللی بایەخێکی
تایبەتی بە رۆڵی کۆمەڵایەتیی ئایین دەدات و وەک گوتمان بە هۆکاری
یەکپارچەیی سیستمی سیاسیی دادەنێت. ماکیاڤیللی لە کتێبی
**گوتارەکان**دا دەڵێت: "هەر دەوڵەتێک لەخواترسانی تێدا نەبێت لە
ناودەچێت..."[٤٧]. ئەگەر خەڵکی کۆمەڵگایەک لە خوا نەترسن بێ سێ و
دوو پێویستە لە میر بترسن. بەڵام بێگومان، ترسان لە میر بە
ئەندازەی ترسان لە خوا، کاریگەرتر نییە. بینراو و بەرهەستبوونی
دەسەڵاتی میر خەڵک دەترسێنێت. کەواتە جەختکردنەوەی ماکیاڤیللی
لە کتێبەکانیدا لەسەر رۆڵی کۆمەڵایەتیی ئایین لەبەر ئەوەیە کە ئەو
ئایین بە هۆکاری پتەوکردن و پاراستنی دەسەڵات لەقەڵەم دەدات.

لە سیستمی فیکریی ماکیاڤیللیدا، ڕووبەڕووی چەمکێکی دیکە دەبینەوە
کە بەخت و شانسە (Fortuna). ئەو بۆ یەکەمجار، ئەم چەمکە لە
نامەیەکدا لە ڕێکەوتی ٣٠ی ئەیلوولی ١٤٩٩ کە بۆ سەرۆکی دیوانی
لۆککا نووسیویەتی بەکاردەهێنێت و بەم شێوەیە دەنووسێت: "من،
وەنەبێ تەنیا لەبەر پاککردنەوەی شاری خۆمان لە پیسیی
تۆمەتبارکردن- شارێک کە ئێوە پیسی دەکەن- بڕیارم دابێت نامەتان
بۆ بنووسم، بەڵکو زێتر لەبەر ئەوەیە کە بە هۆی بەزەیی هاتنەوەم بە
ئێوە ئاگادارت بکەمەوە کە لەمەودوا ئاقڵبی. پێم وایە ئەرکی منە
ئاگادارت بکەمەوە، چونکە بەختی هەردووکمان، وەکویەکە"[٤٨].

دووەمجار کە ماکیاڤیللی ئەم چەمکە و هەروەها چەمکی "لێهاتوویی"
بەکارهێنا، لە بڕگەی دووەمی قەسیدەیەکدا بوو کە بە دەیەکان



(Decennales) ناوی دەبات. ئەو ساڵی ١٥٠٤ دەست بەم بەرهەمە
دەکات و لە بڕگەی دووەمیدا کە لە ساڵی ١٥٠٩دا هۆنیویەتییەوە
دەڵێت: "ئەو زۆر حسێبی بۆ ئابڕووی خۆی دەکرد و لە بەخشینی
ئاڵتونەکانیدا سەخی بوو، و لە سەرتاسەری ژیانیدا بە رادەیەکی
ئەوتۆ لێهاتوویی و گەورەیی خۆی نیشان دا کە زمانم توانای
پێداهەڵگوتنی نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا دەرکراو و نەفرەتلێکراوە، لە
خانووی خۆیدا گۆشەگیر و هەژار و پیر و کوێرە، و بەخت [هیچکات]،
تا ئەو رادەیە پشتی لەم پیاوەباشە نەکردووە"[٤٩]. لە کتێبی میردا زیاتر
ئاشنای واتای ڕاستەقینەی ئەم دوو چەمکە واتە لێهاتوویی و بەخت
دەبین. ماکیاڤیللی، ئەم دوو چەمکە لەم کتێبەدا بەکاردەهێنێت ئەویش
کاتێک باسی داگیرکردنی ناوچە نوێیەکان دەکات. ئەو دەڵێت دەتوانین
کایەی حوکمڕانیی پاشاکان بۆ سێ کۆمەڵە دابەش بکەین: یەکەم ئەو
ناوچانەی کە بە میرات بۆیان ماوەتەوە و هەریەکەیان دەتوانێت بە
ئاسانی بەڕێوەیان بەرێت، "لەم فەرمانڕەوایەتیانەدا ئەگەر ڕێز لە
دابونەریتی باب و باپیران بگیرێت و گرفتەکان بە دەستی شارەزایی
چارەسەر بکرێن، هێشتنەوەی فەرمانڕەوایی بۆ میرێک کە سوود لە
عەقڵ وەربگرێت ئەوەندە سەخت نییە، مەگەر لەناکاو هێزێکی زۆرکار
لەسەر تەخت دایبەزێنێت. ئەگەر پاشایەک بەم شێوەیەش تاج و
تەختی لە دەست بدات، هەرکات رفێنەری تاج و تەختەکە شتێکی لێ
بێت، دەتوانێت دووبارە وەدەستی بێنێتەوە"[٥٠]. دووەمیان "ناوچە
پێکهاتەییەکان" کە پاراستنیان سەختە، بەڵام "سێ ڕێگە هەن بۆ
هێشتنەوەیان: یەکەم، وێرانکردنیان؛ دووەم، دانانی پایتەخت لەوێ و
ژیان بەسەربردنی پاشا تیایدا، سێیەم، سەربەستی پێدانیان بۆ ژیان

بەپێی قانوونی خۆیان و باج لێوەرگرتنیان و لەسەر کاردانانی کۆمەڵێک کە بازرگانی بە پەیوەندیی دۆستانە بکەن"[٥١]. هەروەها سەرەنجام، گرووپی سێیەم، کە ماکیاڤیللی بە "ناوچە نوێیەکان" ناویان دەبات و مەبەستی ئەو ناوچانەیە کە بە هێزی چەک یان بە هۆی لێهاتووییەوە یاخود بە هۆی بەختەوە وەدەستهاتوون. لێرەدا ماکیاڤیللی دوو کەس بە نموونە دێنێتەوە: فرانچسکۆ سفۆرتسا و چزارە بورجا. ئەم دووانە توانیان بە هۆی هەبوونی لێهاتووییەکی زۆر بە هێزی چەک، بە پلەی پاشایەتی بگەن. ماکیاڤیللی ناوی دوو کەسی دیکەش دەبات کە بە پێچەوانەی دوو کەسەکەی بەرێ جوولاونەتەوە، ئاگاتوکلس و ئەلیڤۆرتۆ دیفرمو کە هەر دووکیان بە زەبروزەنگ و بێ رەحمی و خیانەت، بێ ئەوەی لێهاتوو بن و بەبێ یارمەتی بەخت بە فەرمانڕەوایی گەیشتوون. بەڵام بە رای ماکیاڤیللی، بیناتنەرانی راستەقینەی دەسەڵات، ئەو دامەزرێنەر – قانووندانەرانەن کە لە دەسەڵاتی خۆیاندا تەنیا پشت بە لێهاتوویی خۆیان دەبەستن نەک بە بەخت یان بە خیانەت و ناپاکییەوە. بەپێی گوتەی ئەو، لە نێوان ئەم جۆرە دەسەڵاتدارانەدا دەشێ ناوی موسا، کوروش، رۆمۆلۆس و تێسیۆس بەرین. ئەم پیاوانە، بە هۆی ئازایەتیی سیاسی و لێهاتوویی سەربازییانەوە، توانیویانە دەسەڵاتی خۆیان دابمەزرێنن و بیپارێزن. ئەوانە توانیویانە بەبێ هێزی بەخت، بە بەکارهێنانی چەکەکانیان و بێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر هێزی سەربازیی کرێگرتە، بە دەسەڵات بگەن. هێزی چەک تەنیا بەهۆی لێهاتوویی سیاسیی ئەو کەسانەوە توانی کاریگەر بێت. بە رای ماکیاڤیللی پێگە و شوێنی هەرەسهێنانی هەر دەسەڵاتێک لە کێشمەکێشی نیوان لێهاتوویی و



بەخت دایە؛ هەروەها کتێبی **میر** هەڵاتن و ئاوابوونی دەسەڵاتە پاشایەتییەکانمان پێ نیشان دەدات. ماکیاڤیللی لەسەر بنەمای ئەزموونی کۆماری رۆما، لە کتێبی **گوتارەکان**دا باس لە شێوەی سەرهەڵدان و لە نێوچوونی حکوومەتە کۆمارییەکانیش دەکات.
لە رابردوودا گوتمان کتێبی **میر** لە کتێبی **گوتارەکان**ەوە بەرهەمهاتووە، ئێستا هەوڵدەدەین دەریبخەین کە کتێبی **گوتارەکان**یش لە کتێبی **میر**ەوە سەرچاوە دەگرێت. لۆژیکی دەسەڵات هەلومەرج و ئیمکاناتی چۆنیەتیی سیاسەتی کۆماری دەستنیشان دەکات.

## بەشی سێیەم

"لەگەڵ خوێندنەوەی گوتارەکاندا دەتوانین لە دایکبوونی فەلسەفەی نوێ ببینین"

لیۆ شتراوس

# گوتارەکان یان داهێنانی کۆمار



هەر کەسێک بیەوێ بە میتۆدێکی ڕێکوپێک و جیدی، لە بەرهەمە سیاسییەکانی ماکیاڤیللی بکۆڵێتەوە، ناچارە کتێبی **گوتارەکان** بخوێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا و وێڕای بەڵگەنەویست بوونی بایەخی ئەم بەرهەمە، بەڵام ناوبانگی کتێبی **گوتارەکان** نەیتوانیوە هاوتای ناوبانگی جیهانیی کتێبی **میر** بێت. هەر لەبەر ئەوە کتێبی **گوتارەکان** کەمتر لێی کۆڵدراوەتەوە؛ لە هەر جێیەک باسی ماکیاڤیللی بکرێت، کتێبی **میر**مان بیردەکەوێتەوە، وەک چۆن هەر کاتەی ناوی هۆبز و ڕۆسۆ دێنین ناوی گرنگترین کتێبی ئەم دوو بیریارە، واتە **لیڤیاتان** و **پەیمانی کۆمەڵایەتی** (Social Contract)مان بیر دەکەوێتەوە. بەڵام وەک چۆن ناتوانین تەنیا لە ڕێی خوێندنەوەی ئەم دوو کتێبەوە ڕای خۆمان لەسەر بیروڕاکانی هۆبز و ڕۆسۆ دەرببڕین، ئاوەهاش تەنیا بە خوێندنەوەی کتێبی **میر** ناتوانین بانگەشەی ناسینی بیروڕا و تیۆرەکانی ماکیاڤیللی بکەین. کەواتە، لێکۆڵینەوە لە کتێبی **گوتارەکان** پێویستە، تەنانەت ئەگەر لە ڕێی لێکۆڵینەوە لەم کتێبەوە نەشتوانین بگەینە ئەنجامگەلێکی خێرا لەبارەی هونەری سەرکەوتن لە سیاسەتدا. ئەو کاتە پێویستبوونی لێکۆڵینەوە لەم کتێبەمان بۆ دەردەکەوێت کە بزانین ماکیاڤیللی کتێبی **میری** بە پەلە نووسیوە. لە بارێکدا کە کتێبی **گوتارەکان** بەو ڕەوشە نەنووسراوە و ماکیاڤیللی، دوای سێ ساڵ

کاری ڕێکوپێک و جیدی نووسیویەتی و هەوڵیداوە لەم کتێبەدا وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە لە کتێبی **میر**دا خستبوونیەڕوو. لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین ئەم دوو کتێبە، لەگەڵ ئەوەی کە هەریەکەیان نووسینێکی سەربەخۆیە، تەواوکەری یەکترن. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بڵێین بەپێچەوانەی ئەوەی تێبینی دەکرێ، کتێبی **گوتارەکان** چەقی ڕێنماییە سیاسییەکانی ماکیاڤیللییە، چونکە وەک گوتمان، کتێبی **میر** لەو کێشانەوە سەرچاوەی گرتووە کە لەکتێبی **گوتارەکان**دا باسیان لێوە کراوە. بە دەستەواژەیەکی دی "کتێبی **میر** لە پایەکی نزمتری کتێبی **گوتارەکان** دایە"[٥٢]. لەگەڵ ئەوەشدا، خوێنەر، هەر لە لاپەرەکانی یەکەمی کتێبەکەدا پەی بە جیاوازی نێوان ئەم دوو بەرهەمە دەبات؛ بەتایبەت ماکیاڤیللی لە پێشگوتەیەکدا کە بۆ پێشکەشکردنی کتێبەکە نووسیوویەتی، ئەم هەستەی خوێنەر پشتڕاست دەکات. ئەوەی لەم پێشگوتەیەدا جێی سەرسوڕمانە ئەو ئاوازەیە کە ماکیاڤیللی لەبارەی هۆیەکانی نووسینی ئەم کتێبەدا بەکاری دەبات. وەک دەزانین ئەو کتێبی **میر** لە پێناوی **میر**ەکان دەنووسێت. بەڵام موخاتەبەکانی ماکیاڤیللی لە کتێبی **گوتارەکان**دا میرەکان نین، بەڵکو "ئەو کەسانەن کە بەهۆی هەبوونی لێهاتوویی و خەسڵەتی باشەوە، مافی ئەوەیان هەیە ببنە میر"[٥٣]. لە کاتێکدا کە ئەوان هیچ دەسەڵاتێکیان نییە و لەگەڵ ئەوەشدا، ماکیاڤیللی لەگەڵ میرەکاندا یەکسانیان دەکات. کەواتە دەبێ ئەوان کێ بن؟ ئەوانە دوو پیاوی باشی خەڵکی فلۆرەنسان کە یەکیان ناوی چازیمۆ ڕۆچلایی و ئەوی دیکەیان زانوبی بۆیۆن دلمۆنتییە. ئەم دوانە، برادەری ماکیاڤیللین کە شەوان لە باغی ئوریچلاری وتووێژی لەگەڵدا دەکەن، و هەر لە درێژەی ئەم دانیشتنانەدا، و لەسەر داوای



برادەرانی، ماکیاڤیللی بڕیاردەدات گشت ئەزموونەکانی ڕابردوو و بیروڕاکانی خۆی لەبارەی کاروبارەکانی جیهان، لەبەرهەمێکدا تۆمار بکات و بیانخاتە بەردەستی نەوەکانی داهاتوو. بەڵام لە نێو کاروبارەکانی جیهاندا، دەتوانین کاروباری وا بدۆزینەوە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە دونیای کۆن و نوێوە هەیە. کتێبی **گوتارەکان**، لەیەک کاتدا، دوو ناوەڕۆکی هەیە. لەلایەک بابەتی ئەوتۆ دەگرێتەخۆ کە پەیوەندی بە کاروباری دونیای نوێوە هەیە کە کاروبارەکانی دونیای کۆن هەڵدەسەنگێنێت، لەلایەکی دیکەشەوە بابەتی وا کە پەیوەندی بە کاروباری دونیای کۆنەوە هەیە، و وەک نموونەیەک بۆ هەڵسەنگاندنی کاروباری دونیای نوێ بەکار دەهێنرێت. بەم شێوەیە پێویستە بڵێین ئێمە لە یەک کاتدا، چەسپانی دیدگایەکی ئەوتۆ دەبینین کە هەم دەیەوێ پەیوەندیی کاروباری دونیای نوێ بە کاروباری دونیای کۆنەوە بپچڕێنێت و هەم بەردەوامیی پەیوەندییەکە بدۆزێتەوە. ماکیاڤیللی، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو لێکدانەوانەی کە لە دە بەشی یەکەمی کتێبی **مێژووی ڕۆمای** تیتۆس لیڤیۆس دا ئەنجام دراوە، پێکهاتەی سیاسیی ڕۆما شیدەکاتەوە و لە ڕووی جیاجیاوە لەگەڵ بارودۆخی سیاسیی سەردەمی خۆیدا بەراوردی دەکات. بەڵام "هەوڵی ئەو تەنیا لە لێکدانەوەی کتێبی تیتۆس لیڤیۆسدا تەسک ناکرێتەوە، چونکە ماکیاڤیللی ئەرکێکی گرنگتری بە ملەوەیە" لەڕاستیدا، ماکیاڤیللی، دەوڵەت دەخاتە ژێر پرسیارەوە، لە بارێکدا کە تیتۆس لیڤیۆس تەنیا مێژوونووسە"[٥٤]. ئەو لە سەرتاسەری ١٤٢ بەشی کتێبی **گوتارەکان**دا کێشەی دامەزراندنی کۆمار و پارێزگاری لێکردنی، لە پەیوەندی بە ئۆرگانیزەکردنی پێشکەوتن و شێوەی حوکمکردن لەم

رژێمەدا دەخاتەڕوو. بەم پێیە، کتێبەکە بۆ سێ بەش دابەشکراوە کە هەریەکەیان باس لە بابەتێکی تایبەت دەکات. لە بەشی یەکەمدا، باس لە کێشەی ماهییەتی حکوومەتی رۆما و میکانیزمی ئەرکی دامەزراوەکانی دەکرێت. بەشی دووەم تایبەتە بە کاروبارە سەربازییەکان لە کۆماری رۆما. لە بەشی سێیەمدا، رۆڵی ئەو تاکەکەسانە نیشان دەدرێت کە بە پشتبەستن بە هێزی لێهاتوویی و شارەزایی خۆیان، چاودێری هاوسەنگی و پێشکەوتنی کۆماری رۆمایان کردووە. بەم شێوەیە، وەک ماکیاڤیللی لە بەندی نۆیەمی بەشی یەکەمی کتێبەکەدا دەڵێت، کۆششی ئەو بۆ تەفسیرکردنی مێژووی کۆماری رۆما، بە لەبەرچاوگرتنی بابەتەکانی پەیوەندیدار بە یەکەم دەساڵەی کە تیتوس لیڤیۆس باسی لێوە دەکات، لە توێژینەوەی سێ بابەتدا چڕ دەکرێتەوە کە بریتین لە: قانوون ئایینییەکان، قانوون و ڕێساکانی جەنگ، و وتووێژ لەبارەی کەسایەتی دامەزرێنەران-قانووندانەرانی کۆماری رۆما. بەڵام لە راستیدا، دەتوانین ئەم بابەتانە لە پرسیارێکدا چڕ بکەینەوە، کە کتێبی **گوتارەکان** هەوڵدەدات وەڵامی بداتەوە. پرسیارەکە ئەوەیە: باشترین کۆمەڵگا کامەیە؟ بەدەستەواژەیەکی دیکە، ئامانجی کتێبی **گوتارەکان** تەنیا ئەوە نییە کە بونیادی دامەزراوەکانی کۆمەڵگا کۆنەکانمان پێ بناسێنێ، بەڵکو ماکیاڤیللی هەوڵدەدات (و نوێبوونی بیروڕاکانی ئەو هەر لەوە دایە) پەند لە ئەنجامەکانی شکستخواردن و سەرکەوتنی ئەم دامەزراوانە وەرگرێت و کەڵکیان لێ وەربگرێت بۆ بنیاتنانی سیاسەتێکی نوێ کە بتوانێت یەکێتی و ئازادی و بەهێزیی ئیتاڵیا دابین بکات. کەواتە لێکۆڵینەوە لە کاروبارەکانی دونیای کۆن، دەرفەتی ئەوە بە ماکیاڤیللی



دەدات کە ئەزموونەکانی خۆی لەمەڕ کاروبارەکانی دونیای نوێ لە مەحەک بدات. کەواتە، ماکیاڤیللی سەرەڕای ئەوەی کتێبەکەی بە شەن و کەوکردنی بەرهەمەکانی نووسەرە کۆنەکان دەستپێدەکات و دواتر لە بەرهەمەکانی نووسەرانی نوێ دەکۆڵێتەوە، کەچی سیاسەتی نوێ دەخاتە پێش سیاسەتی کۆنەوە. بەڵام نابێ لەو خاڵەش غافڵ بین کە ماکیاڤیللی، زمانی یۆنانیی نەدەزانی و هەر بۆیە نەیدەتوانی دیموکراسیی یۆنانی کۆن بەو چەشنەی کە هەیە بناسێت. کەواتە، وێڕای ئەوەی وەرگێڕانی لاتینی هەندێ لە دەقە یۆنانییەکانی خوێندۆتەوە، بەڵام نموونەی سیاسیی ئەو هەمان ئەزموونی کۆماری رۆمای کۆنە.

کەچی ئەوەی لە کۆماری رۆمای کۆندا سەرنجی ماکیاڤیللی بۆلای خۆی رادەکێشێت، دەسەڵاتی جێبەجێکردنی قانوون، رێکخستنی سەربازی، ئاقڵمەندیی قانووندانەران و ئازایەتی خەڵکە. بە بڕوای ئەو "هەر شارێک ئەگەر بە شێوەی رۆما رێک بخرێت و بەرەو پێشەوە بڕوات، هەر شارێک ئەگەر خەڵکەکەی هەموو رۆژێک بتوانن- جا چ لە کۆڕ و کۆمەڵە گشتییەکان بێت یان لە لاپەڕدا- ئاستی لێهاتوویی سیاسی و ئازایەتیی خۆیان بەرز بکەنەوە و بەسەر هێزی بەخت و رێکەوتدا زاڵ بن، هەمیشە و لە هەموو بارودۆخێکدا دەتوانن وەکو رۆما، هێزی گیانی و مەعنەویی خۆیان بپارێزن"[٥٥]. ماکیاڤیللی بانگهێشتی قانووندانەرانی سەردەمی نوێ دەکات کە بایەخ بە بەرهەمە سیاسییەکانی رۆمای کۆن بدەن بۆ ئەوەی باشتر بتوانن لە بنەماکانی دەوڵەتی نوێ تێبگەن. بەڵام پێشنیارەکەی، زێتر ئەو لایەنەی تێدا دیارە کە هانی قانووندانەران دەدات بۆ ئەوەی لە بنەما سیاسییە

باوەکانی ناو کۆماری رۆمای کۆن بکۆڵنەوە، دەنا ئەو لە بنەڕەتدا بە لاساییکردنەوەی سادە و دەقاودەق رازی نییە. ماکیاڤیللی، تەنیا لە یەک شتدا، بەلاساییکردنەوە رازییە، ئەویش لێهاتوویی سیاسییە کە لە سەردەمی کۆندا هەبووە. جگە لەوە، وەک گوتمان، ئەو بنەماکانی ئەخلاقی مەسیحی دەخاتە ژێر پرسیارەوە و بە ئاشکرایی مەحکومی دەکات.[٥٦] لەو کاتەی کە لۆتەر لە هەوڵی گۆڕینی ڕێنمایی و ڕێوڕەسمە کڵێساییەکاندا بوو، ئەویش هەوڵدەدا بە رەخنەگرتن لە دەسەڵاتی دەزگای پاپا، بنەماگەلێکی ریفۆرمیستیی نوێ بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی سیاسی پێشنیار بکات. هەوڵەکانی ماکیاڤیللی لەبارەی جیاکردنەوەی کاروبارە سیاسیەکان لە کاروبارە ئایینیەکان، بووە هۆی ئەوەی کە بە خاوەنی بیروباوەڕی "پێچەوانەی ئەخلاق" ناوبانگ دەربکات. ئەم تۆمەتەش ناوبانگی ماکیاڤیللی زیاتر کرد کە لەرێی نووسینی کتێبی میرەوە وەدەستی هێنابوو، کە وەک "سیاسەتوانێکی وشک و بەوردە" ناسرابوو. بەڵام پێویستە بزانین کە هۆی رەخنەگرتنی ماکیاڤیللی لە ئەخلاقی مەسیحی ئەوەیە کە بەڕای ئەو، ئەم رەوشتە دەبێتە هۆی ئەوەی تاکەکەسان بایەخ بە لێپرسراوێتییە کۆمەڵاتییەکانیان نەدەن، دەنا لە بنەڕەتدا ئەو دژی رەوشتەکان نییە. ئەو رەوشتەی کە ئەو بە پێوەری دادەنێت، جەوهەرێکی مەدەنیی هەیە و بنەماگەلێکی سیاسی ئەوتۆ پەسند دەکات کە پێویستە هاووڵاتیانی هەموو شارێک، لەبەر چاوی بگرن. بەم شێوەیە، ئەو ئەخلاقەی ماکیاڤیللی پەسندی دەکات، زێتر لە کۆمەڵە قانوونیەک دەچێت کە پێکهاتەی پەیوەندییەکانی نێوان هاووڵاتیانی کۆمەڵگایەکی سیاسی دیاردەکات. کەواتە رەخنەگرتنی ماکیاڤیللی لە ئەخلاقی مەسیحی



"هەوڵدانێکە بۆ ئەوەی چەمکی مرۆڤخوازی (Humanism) بخاتە جێی چەمکی دوورەپەرێزییەوە"[٥٧]. چونکە، بە بڕوای ماکیاڤیللی، هۆی پێشکەوتن و پایەبەرزیی دەوڵەتەکان بۆ دوورەپەرێزیی تاکەکەسانی ناگەڕێتەوە، بەڵکو بەندە بە هێزی داهێنەرانەیانەوە. سیاسەتوان ناتوانێت لەرێی دوورەپەرێزیی لە ژیانی سیاسییەوە، دەوڵەت دابمەزرێنێت و قانوون دابهێنێت. لەرێی رەتکردنەوەی کاروبارەکانی مرۆڤ، ناتوانرێت کاری سیاسی (سیاسەت) ئەنجام بدرێت. کەواتە، سیاسەت، کاری خەڵکە نەک کاری خواکان. هەروەها هەر لەبەر ئەمەش ماکیاڤیللی ئایین بە هۆکارێک (ئامرازێک) بۆ سیاسەت دادەنێت، کەواتە، بەڕای ئەو، ئایین دەشێ ببێتە هۆی پتەوبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت، چونکە "بایەخدان بەجێبەجێکردنی ئایینەکان، دڵنیاترین زامنی پایەبەرزبوونی کۆمارەکانە"[٥٨]. هەر بۆیە، ماکیاڤیللی فەرمانڕەواکانی پاشایەتی و کۆمارەکان ئاگادار دەکاتەوە کە بۆ هێشتنەوەی خۆیان بێ بایەخی بە کاروبارە ئایینیەکان نەکەن. ئەو دەڵێت "کەواتە ئەرکی میر و سەرۆک کۆمارەکانە پارێزگاری لە بنەما ئایینییەکان بکەن، چونکە هەوڵدان بۆ بەئایینیکردنی خەڵک زۆر زەحمەت نییە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوان باش و یەکگرتووبن"[٥٩]. ماکیاڤیللی لەگەڵ وتنی ئەم قسەیە مرۆڤخوازیی ئینجیلیانەی کەسانی وەک ئەراسمۆس دەخاتە ژێر پرسیارەوە. وەک دەزانین ئەو فەیلەسووفە پێی وابوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی پێویستە دەستەیەک لە سیاسەتوانانی مەسیحی پێکبهێنرێت؛ لە کاتێکدا بەڕای ماکیاڤیللی، سیستمی سیاسی لایەنی ئایینی نییە و سەرەڕای ئەوەی کە ئایین بە دامەزراوێکی بەسوود و کاریگەر

لەقەڵەم دەدات، بەڵام ئەو دەسەڵاتەی کە باسی لێوە دەکات دەسەڵاتی ئایینی نییە. بنەما و بنچینەی ئەم دەسەڵاتە شارەزایی و زیرەکیی قانووندانەرانە "کە پێویستە زێتر خزمەتی بەرژەوەندیی گشتی نیشتمانی خۆیان بکەن نەک بەرژەوەندی خۆ و میراتگرانیان"[٦٠]. هەر کەسەی وڵاتی خۆی خۆش بوێ و بیەوێ خزمەتی بەرژەوەندیی گشتی بکات بێگومان هەوڵی وەدەستهێنانی پایەبەرزی و ئیعتیباری خۆیشی دەدات. هەروەها گومانی تێدا نییە کە هیچ چالاکییەکی سیاسی، بەهۆی پیادەکردنی ئەو رەوشتانەی کە بانگەشەی دوورەپەرێزی و دابڕان بۆ تاک دەکەن، ئەنجام نادرێت. جگە لەمە، ماکیاڤیللی ئەزموونی ئایینیی رۆمای کۆن دەخاتە بەرانبەر ئەخلاقی مەسیحییەوە و ئەوەی لەم ئەزموونەدا سەرنجی ماکیاڤیللی بۆ خۆی رادەکێشێت رۆڵە شارستانییەکەیەتی. بەرای ماکیاڤیللی، رێکخستنی شاری رۆما بەپێی ئایینی باو لەوێدا، ئەزموونێکی سەرنجڕاکێشە و "دەکرێ بیری ئایینی رۆما بە فاکتەرێک بۆ ناسینی مرۆڤەکان دابنرێت"[٦١]. بەگوتەیەکی دیکە، لە کۆماری رۆمای کۆندا پێویستە ئایین زێتر بە فاکتەری یەکپارچەیی کۆمەڵگا لەقەڵەم بدرێت نەک وەک فاکتەرێک کە ژیانی ئەم دونیایە لە ژیانی ئەو دونیا جیا دەکاتەوە. لە کۆماری رۆمادا ئایینی دەوڵەت ئیعتیبارێکی تایبەتی هەیە چونکە ئایین شەرعییەتی پێ دەبەخشێت. لە کۆماری رۆمادا، جێبەجێکردنی ئەرکە مەدەنییەکان لە لایەن هاووڵاتیانەوە گرنگییەکی زۆری هەیە؛ هەروەها "خواوەندانی رۆما تەنیا لەو کردەوە ئایینیانەدا کە لە رەهەندی زەمەنیی مرۆڤەکاندا ئەنجام دەدرێن، ئامادەییان هەیە..."[٦٢]. کەواتە، زەمەنی سیاسی زەمەنی گشت کاروبارەکانی دیکە دیاردەکات. لەم



کۆمارەدا، کاروباری ئایینی لەرێی ئەخلاقی مەدەنی و بۆ چەسپاندن و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی، خۆیان دەردەخەن. بەڵام ئەو کەسەی کە باسی ئەخلاقی شار دەکات، هەر بەو پێیە باس لە چالاکییە مەدەنییەکانی خەڵکی ئەو شارەش دەکات. بۆیە ماکیاڤیللیش لە کتێبی گوتارەکاندا لە سوودەکانی بەشداریکردنی سیاسیی هاووڵاتیانی رۆما لە ژیانی شاردا دەکۆڵێتەوە و سەرنجی هاوچاخانی خۆی بۆ ئەو گرنگییەی کە بەشداریکردنی خەڵک لە پاراستنی کۆماردا هەیەتی رادەکێشێت. هەروەها دەڵێت: "هەر کۆمارێک کە نەیەوێ لە خەڵک بێ منەت بێت، پێویستە وەک کۆماری رۆما هەڵسوکەوت بکات؛ هەر هاووڵاتییەک بیەوێ لە ژیانی سیاست بە دوور بێت، پێویستە چاو لە هەڵسوکەوتی رۆمییەکان بکات"[٦٣]. ماکیاڤیللی لە کتێبی **گوتارەکان**دا، جارێکی دیکە (بەو شێوەی کە لە کتێبی میردا ئەنجامی داوە) پێ لەسەر رۆڵی گرنگی خەڵک لە بنیاتنانی دەسەڵاتدا دادەگرێت. وەک دەزانین لە کتێبی میردا بەردەوام ئەم بابەتە دووبارە دەکاتەوە کە هەموو دەوڵەتێک پێویستە وا بکات خەڵک رێزی لێبگرن و خۆشیان بوێت بۆ ئەوەی بتوانێت لەسەر پێ بووەستێت. لە کتێبی **گوتارەکان**دا بیروڕاکانی ماکیاڤیللی لە بارەی خەڵک و چالاکییەکانیان لە بەرانبەر دەوڵەتدا بەدی دەکەین. بەڵام ماکیاڤیللی لەم کتێبەدا وەک هاووڵاتیانی رۆما سەیری خەڵک دەکات، واتە "ئەو خەڵکانەی کە بایەخ بە بەرژەوەندیی گشتی و سەروەریی نیشتمان دەدەن". بەرای ماکیاڤیللی ئەوان خەڵکانێکن کە حکومەتی کۆمارییان لە حکومەتی پاشایەتی پێ باشترە. هەر لەبەر ئەوە خەڵک لەگەڵ میرەکاندا بەراورد دەکات و دەڵێت "ئەگەر کارە هەتکبەر و جێی شانازییەکانی میرەکان و خەڵک

لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکەین، دەبینین خەڵک کەمێک لەوان بەرزترن. تەنیا ئەگەر میرەکان بەهۆی دانانی قانوونەکان، دامەزراندنی دەوڵەت، هێنانە دیی شێوەیەکی نوێی حکومەت خۆیان بە بەرزتر بزانن، دەنا خەڵک زۆر لەوان بەرزترن، چونکە سیستمی جێگیر دەپارێزن و سەربەرزی قانووندانەرانی خۆیان زیاد دەکەن"[٦٤].

بە رای خوێنەرانی کتێبی **میر** رەنگە ئەم رستانە سەرسوڕهێن بن، چونکە ئەوان ماکیاڤیللی بە کەسێکی لایەنگری بێ سێ و دووی پاشایەتی لەقەڵەم دەدەن. لەبارێکدا کە هیچ بۆچوونێک لەوە هەڵەتر نییە کە پێمان وا بێت ماکیاڤیللی لەم دوو کتێبەدا بە دوو شێوەی جیاواز قسە دەکات. ئەو هەمیشە -تەنانەت ئەو کاتەش کە حکوومەتی خەڵک دەخاتە جێی حکوومەتی پاشایەتییەوە (میرنشینییەوە)- پابەندی بیروڕاکانی خۆیەتی. لە کتێبی **گوتارەکان**دا، کەسایەتی دامەزرێنەری دەوڵەت، ناوەندی بایەخپێدانی ماکیاڤیللیی داگیر نەکردووە، بەڵکو بایەخ بەو کەسایەتییانە دەدات کە راستەوخۆ، دەوریان لە شێوەگرتن و چەسپاندنی سیاسەتدا هەیە. بە دەستەواژەیەکی دیکە، لە کتێبی **گوتارەکان**دا ماکیاڤیللی بایەخ بە پەیوەندیی نێوان میر و خەڵک یان دامەزرێنەر و بکەری سیاسی، یاخود پەیوەندی نێوان دەوڵەت و هاووڵاتیان دەدات، ئەویش زێتر لە روانگەی هاووڵاتیانەوە نەک دەوڵەت. لە کاتێکدا، لە کتێبی میردا، لە روانگەی دەوڵەتەوە لەم پەیوەندییە دەڕوانێت. کتێبی **گوتارەکان** لە بنەڕەتدا لە "کاروباری گشتی" (res-publica) -واتە لەبارەی ئەو پانتایی و کایە سیاسییەی کە هاووڵاتیان تێیدا دەژین، و ئەو قانوونیەی کە بەسەریدا زاڵە- دەکۆڵێتەوە. کەواتە مانەوەی هەر کۆمارێک، ئەنجامی پەیوەندیی هاوسەنگی نێوان کردەوەی هاووڵاتیان و هێزی قانوونەکانە. لەم



ڕووەوە، بە رای ماکیاڤیللی، ئازادی لە دەرەوەی سنوورەکانی قانوونەوە بوونی نییە، هەر چالاکییەک کە لە دەرەوەی سنوورەکانی قانوونەکانەوە ئەنجام بدرێت، لەوانەیە بناغەی کۆمار بخاتە مەترسییەوە. بە دەستەواژەیەکی دیکە، نابێ هاووڵاتیان لە سنووری بڕیاری قانوونەکان دەربچن. بەڵام لەلایەکی دیکەوە، "پێویستە هەموو دەوڵەتێکی ئازاد و سەربەخۆ ، رێگەیەکی گونجاو بۆ هێنانەکایەی بواری دەرخستنی پلەوپایەخوازییەکانی خەڵک بکاتەوە. کۆمارەکان، پێویستە زێتر سەرنجی ئەم شتە بدەن، چونکە ئەوان لە بارودۆخە سەخت و نالەبارەکاندا جگە لە هێزی خەڵک هێزێکی دیکە شک نابەن"[٦٥]. پێویستە لەسەر دەوڵەت رێگە لە دەربڕینی هەموو جۆرە توندوتیژی و کارێکی زۆردارانە سەبارەت بە گشت تاکێک بگرێت؛ چونکە "هەر جۆرە توندوتیژی و کارێکی زۆردارانە، ترس دەخوڵقێنی؛ ئەو کەسەی ترساوە، ناچار بە دوای دۆزینەوەی هۆیەکانی بەرگریکردن لە خۆیدا دەگەڕێت و گروپێک بۆ پشتیوانیکردن لە خۆی هان دەدات. لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەم پشتیوانانە، کۆمەڵگای مەدەنی بۆ کۆمەڵێک گرووپی جۆراوجۆر دابەش دەبێت، و لەگەڵ پەیدابوونی ئەم گرووپانەدا، دەوڵەت بەرەو لەناوچوون و هەرەسهێنان دەڕوات"[٦٦]. لە حکوومەتی کۆماریدا، هەموو هاووڵاتییەک مافی ئەوەی هەیە سکاڵا لە هەڵە و کارە ناقانوونییەکانی خەڵکی دیکە بکات، بەڵام کەس بۆی نییە خۆی حوکم دەربکات و سزا نووسراوەکانی ناو قانوونەکان جێبەجێ بکات. بەم شێوەیە پێویستە تاوانبارکردن "لەبەردەم خەڵک یان لەبەرانبەر ئەنجوومەن یان دادوەردا..."[٦٧] ئەنجام بدرێت. ئەرکەکانی سیاسەتوان، ئەرکەکانی قانووندانەریشی دێتە سەر، و هەر ئەویشە کە پێویستە کارێکی زۆر سەختی وەک دانانی قانوونەکانی کۆماری ئەنجام بدات. هەر

چەندی قانووندانەر ئاقڵتر بێت، بەو ئەندازەیە ئەو قانوونیانەی کە بۆ پاراستنی شیرازەی (Order) گشتی و ئارامیی خەڵک دایدەنێت کاریگەر دەبن. کەواتە، بوونی قانووندانەر بۆ پاراستنی ژیانی کۆمار پێویستە. ئەگەر قانووندانەر چالاکی نەنوێنێت، کۆمار رووبەڕووی سەختی و تەنگوچەڵەمە دەبێتەوە. وەک دەزانین دەستوور، تاکە زامنی بوونی ئازادییەکانە. "هەموو ئەو قانووندانەرانەی کە بۆ کۆمارەکان دەستووری ژیرانەیان نووسیوەتەوە هەمیشە چاودێری ئەوەیان کردووە کە دامەزراوەگەلێک بۆ پاراستنی ئازادییەکان بێننەئاراوە، و بە پێی دروستی یان نادروستی، و گونجان یان نەگونجانی ئەم دامەزراوانە لەگەڵ بارودۆخی واقعی (باو)دا، تەمەنی ئازادی، کورت یان درێژ بووە"[٦٨]. کەواتە وەک دەبینین ماکیاڤیللی زۆر بایەخ بە رۆڵی قانووندانەر لە حکوومەتی کۆماریدا دەدات. ئەم حوکمە لەمەڕ رژێمە پاشایەتییەکانیش راستە. لەم جۆرە حکوومەتانەدا، هێز و بەردەوامیی قانوونەکان بەندە بە ژیری و هۆشمەندیی میرەوە. دامەزراندنی هەموو دەوڵەتێک پێویستی بە دانانی دەستوورێک هەیە، بەرزی و گەورەیی هەر دەوڵەتێک بەندە بە پلەی توندی و نەرمیی ئەم قانوونانەوە. بۆیە پێویستە بتوانین هەموو دەستوورێک لە کاتی خۆیدا راست بکەینەوە، تەنانەت ئەگەر حاڵەتی ئەم راستکردنەوانە کەمیش بن. لەبەر ئەوە "دەستووری هەر دەوڵەتێک ئەو کاتەی کە بەکارنەهاتنی دەرکەوت یان پێش ئەوەی کەموکووڕییەکانی لای هەمووان ئاشکرابێت، پێویستە بە یەکجار یان هەنگاو بەهەنگاو بگۆڕێت"[٦٩]. بەڵام زۆربەی کات گۆڕینی هەر دەستوورێک، پێویستی بە هەبوونی پلانێک بۆ چاکسازیی رێکخستنی سیاسیی وڵات هەیە؛ بەتایبەت کە لە دەوڵەتە خراپ و تێکچووەکاندا، دەستوور ناتوانێت رۆڵی



پارێزگاریکردن لە ئازادییەکانی هاووڵاتیان بگێڕێت، بەڵام "کاری نوێکردنەوەی هەنگاو بەهەنگاوی دەستوور پێویستە لەڕێی تاکەکەسانی ژیر و زاناوە ئەنجام بدرێت، تاکەکەسانی ئەوتۆ کە بتوانن کەموکووڕییەکان هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیانەوە یان پێش ئەوەی لای هەمووان ئاشکرا ببن، دەستنیشان بکەن. رەنگە ئەم جۆرە تاکەکەسانە لە وڵاتدا نەبن، خۆ ئەگەر کەسێکیش دەست بکەوێت، رەنگە نەتوانێت قەناعەت بە ئەوانی دیکە بکات  کە ئەو کەموکووڕییانە هەن و تەنیا خۆی توانیویەتی بیاندۆزێتەوە؛ چونکە بۆ ئەو کەسانەی کە خوویان بە هەندێ نەریتەوە گرتووە، ملکەچبوون بۆ گۆڕانی ئەو نەریتانە، زۆر زەحمەتە. بە تایبەت کاتێک کە ئەو کەموکووڕییانەی باسیان دەکرێت  بە تەواوی هەستپێکراو نەبن و  بە گومانەوە بخرێنەڕوو"[٧٠]. کەواتە پێویستە دامەزرێنەران–قانووندانەرانی نوێ بە دەسەڵات بگەن بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لە قانوونەکان و بونیادی دەوڵەتدا بهێننەکایەوە.

بەڵام سەلامەتیی هەر کۆمارێک و رزگارکردنی لە کۆت و بەندی خراپە و گەندەڵی، تەنیا پەیوەندی بە هۆشیاریی سیاسەتوانێک و پیاوێکی دەوڵەتەوە نییە، بەڵکو، پەیوەندی بە لێهاتوویی و پایەبەرزیی هاووڵاتیانیشەوە هەیە. بەو واتایەی کە "هەموو ئەو کەسانەی دەیانەوێ گۆڕانکاری لە حکوومەتی کۆماریدا بهێننەکایەوە، پێویستە زۆر بە وردی تاوتۆیی ئەو مەسەلەیە بکەن کە ئەو کۆمارە لە چ بارودۆخێکدایە و بەم پێیە، سەختی کاری خۆیان دەرک بکەن؛ چونکە، وەک چۆن بەخشینی ئازادی بەو خەڵکانەی دەیانەوێت بە کۆیلەیی بمێننەوە سەخت و ترسناکە، ئاوهاش هەوڵدان بۆ بەکۆیلەکردنی ئەو خەڵکانەی دەیانەوێت بە ئازادی بژین سەخت و ترسناکە"[٧١]. کەواتە تا ئەو کاتەی هاووڵاتیانی





کۆمارێک لە گەندەڵی پارێزراو بن، مەترسیی هەرەسهێنان هەڕەشەیان لێ ناکات؛ هەروەها تا ئەو کاتەی دەوڵەتێک چاودێری ئازادی هاووڵاتیانی خۆی بێت، ئەوان لە مەترسیی خراپەکاری و هەرەسهێنان پارێزراو دەبن؛ "ئەزموونیش دەری دەخات کە هەرگیز خەڵک ناتوانن سەروەت و دەسەڵاتی خۆیان زیاد بکەن مەگەر لە حکوومەتێکی ئازاد دا بژین. لە راستیدا پێویستە یۆنانی ئەو سەردەمە بە باشی بنرخێنین کە لە ستەمی پیسیس تراتیدسەکان رزگار بوو و لە ماوەیەکی کەمتر لە سەد ساڵ بەو ئاستە بەرزە گەیشت. بەڵام لەوەش شکۆدارتر، ئەو پلەوپایەیە کە رۆما- دوای وەدەرنانی پاشاکانی- پێی گەیشت"[٧٢]. بە بەرز نرخاندنی هاووڵاتیانی کۆماری رۆما لە لایەن ماکیاڤێللییەوە تەنیا یادەوەرییەکی سادە نییە، بەڵکو لەوەش زێتر دەروات. ئەرکی هەموو خوێنەرێکی بەرهەمەکانی ماکیاڤێللی ئەوەیە کە دروستیی ئەم کارەی ئەو لە پەیوەندی بە واقعی سیاسیی کۆمەڵگای رۆما شەن و کەوبکات.

ئەگەر لەم روانگەیەوە سەیری مێژووی رۆما بکەین دەبینین کە نووسینە پڕ لە ستایش و پێداهەڵگوتنەکانی مێژوونووسانی کۆنی مێژووی کۆماری رۆما، ریۆشوێنی پیادەکردنی دەسەڵات لەم کۆمەڵگایەدا دەشارنەوە. لەم بارەوە دەتوانین باس لە بیروڕاکانی پۆلیبۆس لەمەڕ شاری رۆما بکەین. "لە بەشی شەشەمی کتێبی مێژووی ئەودا چەند لاپەڕەیەک بەرچاو دەکەون کە ناوەڕۆکەکەیان زۆر تەمومژاوییە. ئەو لەم لاپەڕانەدا، چەمکگەلێکی نیمچە تیۆری و پێکناکۆک کە لە قوتابخانە تایبەتییەکانی فێربوونی هونەری وتاربێژیدا دەخوێنران، تێکەڵ و پێکەڵ دەکات (لە سەردەمی *هێلینیزم* - *یۆنانیگەری*دا، تاکەکەسانی چینی فەرمانڕەوا، کە ئەندامی گرووپی ئاخنی بوون،



منداڵەکانیان دەنارده ئەم قوتابخانەیە). لە ئەنجامدا پۆلیبۆس ناچار ناتوانێت وێنەیەکی راستەقینەی بونیادی دەوڵەتی رۆما بە دەستەوە بدات. شیکردنەوە زهنییەکانی کە بانگەشەی گەورەیان تێدایە بەڵام رووکەشانەن، دەبنە هۆی ئەوەی ماکیاڤێللی نەتوانێت چوارچێوەی قەشەنگی ژیانی سیاسیی رۆما- کە لە سەرتاسەری ئەم ماوەیەدا ببووە هۆی بەردەوامیی فەرمانڕەوایی و باڵادەستیی خانەدانەکان- ببینێت"[٧٣]. پۆلیبۆس پێی وایە چالاکییەکانی جەماوەر رۆڵێکی زۆر گرنگیان لە بەڕێوەبردنی سیاسیی رۆمادا هەبووە. لە کاتێکدا کە وەک دەزانین بەشداربوونی خەڵک لە کۆماری رۆمادا زۆر سنووردار بووە، چونکە پیادەکردنی دەسەڵات، تەنیا و هەمیشە لە دەستی گرووپێکی بچووکی سەرکردەکاندا مابووەوە. لە کۆماری رۆمادا، سەرکردە راستەقینەکان هەمان ئەو دادوەرانەن کە بە ناوی خەڵک، دەسەڵات پیادە دەکەن، و هیچ کات خەڵک ئەم دەرفەتەیان بۆ نارەخسێ. لە رۆمادا، رەوش و جێبەجێکردنی قانوونەکان، لە دەستی هاووڵاتیاندا نەبوو. لەو رووەوە کۆماری رۆما جیاوازییەکی بنەڕەتیی هەیە لەگەڵ شاری ئەسینادا. ئەسینا تاکە نموونەی جێبەجێکردنی دیموکراسییە لە سەردەمی کۆندا. بەڵام پێویستە بڵێین پیادەکرنی دیموکراسی لە کۆماری رۆما، زێتر لایەنێکی ئیرادییانەی هەیە. لە هەمان کات کە ئەسینا دیموکراسی پەسند دەکات، رۆما لە پیادەکردنی دیموکراسی پاشگەز دەبێتەوە. هاووڵاتیانی رۆما، یەکە یەکەیان بەرپرسن لە رەتکردنەوەی بیرۆکە و جێبەجێکردنی دیموکراسی. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو مێژوونووسە کۆنانەی کە لە شاری رۆمادا دەژیان، لە بەرهەمەکانیاندا نەک هەر ناپرژێنە سەر ئەم کێشەیە،

بەڵکو بە پێچەوانەشەوە، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان نووسینەکانی ئەوان و واقعی کۆمەڵایەتی- سیاسیی کۆماری رۆمادا هەیە.

ماکیاڤیللی وێڕای ئەوەی کە بە قووڵی لە گرنگیی ئەم کێشەیە ئاگادارە، بەڵام هیچ ئاماژەیەکی پێ ناکات. بە بڕوای ئەو "پێویستە لە بەرانبەر رەخنەی رەخنەگراندا بەرگری لە رژێمی رۆما بکەین. ئەو لەو بارەوە مەسەلەکە پەردەپۆش دەکات و ناوی ئەو رەخنەگرانە نابات"[۷٤]. لەگەڵ ئەوەشدا نابێ پێداهەڵگوتنی ماکیاڤیللی بەسەر کۆماری رۆمادا بە پێداهەڵگوتنی دیکتاتۆری لەقەڵەم بدەین. ئەوەی لە کۆماری رۆمادا سەرنجی ماکیاڤیللی بۆ خۆی رادەکێشی، هەم بوونە قانوونییەکەیەتی وەک کۆمارێک، و هەم دەسەڵاتی سەربازییەتی وەک شارێکی شەڕخواز. ئەو دەیەوێ هەمان ئەو کۆنترۆڵە مەدەنییە و ئەو رێزگرتنە لە رێکخستنی گشتی کە لە کۆماری رۆمادا هەبوو، لە ئیتاڵیای سەردەمی خۆشیدا بچەسپێنێت. کەواتە ئەوەی بە لای ماکیاڤیللییەوە گرنگە رێککەوتنی نێوان هاووڵاتیانی کۆمەڵگایەکی سیاسییە. وەک لە پێشگوتەی مێژووی فلۆرەنسادا دەڵێت: "وانەی بە سوود بۆ ئەو هاووڵاتیانەی کە لە کۆمارەکاندا دەژین، ناسینی رەگوڕیشەی تۆڵەسەندنەوە و ناکۆکییەکانە و بۆ ئەوەی پەند لە لەناوچوونی خەڵکانی دیکە وەرگرن و ئاقڵ بن و بتوانن هاوڕێیەتیی خۆیان بپارێزن".

بەم شێوەیە دەبینین ماکیاڤیللی هەوڵدەدات لەو دیوی ئەو ناکۆکی و ناهەماهەنگییانەی کە دەبنە هۆی پارچەپارچە بوونی کۆمەڵگا مرۆییەکان، جەخت لەسەر پێویستبوونی هێنانەدی لێهاتوویی و پایەبەرزیی مەدەنی بکاتەوە -کە ئازایەتی و هێزی خەباتکردن لە پێناوی سەرکەوتن و پێشکەوتنی نیشتمان بە هاووڵاتیان دەبەخشێت- . هەر بۆیە بەرای ئەو



سیاسەت بریتییە لە هونەرێک بۆ کۆکردنەوە و یەکخستن، نەک بۆ جیاوازی و ناکۆکی نانەوە. بەڵام پێویستە سەرنجی ئەم خاڵەش بدەین کە بە بڕوای ماکیاڤیللی، هونەری کۆکردنەوە و یەکخستنی تاکەکانی کۆمەڵگا، بە واتای "بەپاڵ یەکەوەنانی خەڵک" نییە، چونکە جموجۆڵی ئەم خەڵکانە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کردەوە تاکەکەسییەکانی هاووڵاتیان لە کۆمەڵگادا، بواری دەرکەوتنیان بۆ نەڕەخسێ. بۆ سەلامەتیی کۆمەڵگا هیچ ناکۆکییەک لەوە زیانبەخشتر نییە. لەبەر ئەوە، ماکیاڤیللی، فێربوونی بنەماکانی مەدەنییەت دەخاتە چەقی بیرکردنەوە سیاسییەکانی خۆی. هیچ شارێک بەبێ هەبوونی هاووڵاتیی ژیر ناهێتەکایەوە، هەروەها هەر کەسێ باس لە هاووڵاتیان بکات بێگومان بایەخ بە فێربوونی بنەماکانی ژیانی مەدەنی دەدات؛ لە پەراوێزی ئەم بنەمایانەوەیە کە "سیاسەتی هاوسەنگی" لە دایک دەبێت و گەشە دەکات. ئامانجی سەرەکی بەرهەمەکانی ماکیاڤیللی ئەوەیە کە بیروڕا بەنرخەکانی دامەزرێنەران - قانووندانەرانی سەردەمی کۆن بۆ خەڵکی سەردەمی رێنسانس روون بکاتەوە. بە رای ماکیاڤیللی، لەبەر ئەوەی مرۆڤ ناچارە لە کۆمەڵگای سیاسیدا بژیت، بۆیە پێویستە لەسەری رێگاکانی سەقامگیربوونیشی بدۆزێتەوە.

دەتوانین پەندێکی گەورە لە بیروڕاکانی ماکیاڤیللی وەرگرین، ئەو پەندەش ئەوەیە کە: سەقامگیربوونی کۆمەڵگا بەبێ ئازادیی سیاسی نایەتە کایەوە و وەک ریمۆن ئارۆن دەڵێ: "ئازادیی سیاسی دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵک لێهاتوویی پێویست بۆ پاراستنی بەدەستبێنن و ببن بە هاووڵاتی. ئازادی سیاسی، وەنەبێ خەڵک بگۆڕێت بۆ تاکەکەسانی خۆبەدەستەوەدەر لەبەرانبەر هەموو شتێکدا یان خەڵکی هەڵگەڕاوە و یاخی، بەڵکو دەیانکات بە مرۆڤگەلێکی رەخنەگر و بەرپرس".

## ئەنجام

"ناوی ماکیاڤێللی بەکردەوە بووە بە رەمزی سیاسەتی رووت"

بنێدتو کروچە

# سیاسەت لە روانگەی ماکیاڤێللییەوە



لە لاپەڕەکانی پێشوودا هەوڵمان داوە بیروڕا سیاسییەکانی ماکیاڤێللی لە چوارچێوەیەکی یەکگرتوودا و لە رووی پێکهاتەییەوە دەرببڕین. هەروەها هەوڵمان داوە رەهەندە جۆراوجۆرەکانی رەسەنایەتی و قووڵایی بۆچوون و بڕواکانی ماکیاڤێللی لە رێی شەن و کەوکردنی دوو بەرهەمی گرنگی ئەودا روون بکەینەوە. ئەو قەیرانەی کە ئێستا سیاسەت رووبەڕووی بۆتەوە، وەنەبێ هەر تەنیا رژێمە سیاسییە جۆراوجۆرەکانی گرتبێتەوە، بەڵکو قەیرانێکە زێتر دووچاری چەمکی سیاسەت بۆتەوە. ئایا تا چەند ئەم چەمکە دەربڕی واقعێکە کە لە دونیای ئێستادا لەبەرچاومانەوەیە. ئەمە کێشەیەکە ژێرخانی ئەم قەیرانەی داگیرکردووە. هەر بۆیە حوکمدان لەبارەی ئەم دوو حاڵەتە، لە رێی دابڕان و لێکجیاکردنەوەیان، بێگومان یەکەم هەنگاوە بەرەو بیرکردنەوە لەم قەیرانە. بەڵام لێکجیاکردنەوەی چەمکی سیاسەت و واقعی سیاسی، بە واتای جیاکردنەوەی کایەی فیکر لە کایەی کردار لە سیاسەتدا نییە. ئەوەی لێرەدا گرنگە بیرکردنەوەیە لەبارەی چەمکی سیاسەت لە رێی دیاریکردنی سنوورە واقعیەکەی.

بە لەبەرچاوگرتنی رەگوڕیشەی یۆنانیی وشەی سیاسەت (پۆلیتێیا) دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە سیاسەت هەمیشە بە واتای زانست

یان هونەری دەستەمۆکردنی دەسەڵات بەکارنەهێنراوە. لە یۆنانی
کۆندا سیاسەت بە مانای بەشداریکردنی هاووڵاتیان (پۆلیتایی) بوو لە
بەڕێوەبردنی کاروباری شار (پۆلیس)دا. کەواتە ئەو کات چەمکی
سیاسەت هەم هاووڵاتیان و هەم دەستوور واتا بونیادی شاری
دەگرتەخۆ. هەر بۆیە فەیلەسووفێکی وەک ئەرستۆ، وێڕای ئەوەی کە
بیریارێکە لە سەدەی چوارەمی پێش زایین ژیاوە، بەڵام بیروڕا
سیاسییەکانی رەنگدانەوەی واقعە سیاسییەکانی سەدەی پێنجەمی
پێش زایینی پێوە دیارە. ئەو لە بەشی یەکەمی بەندی یەکەمی نامەی
"سیاسەت"ی خۆیدا ناوی شار دەبات بە "کۆمەڵگای سیاسی".
مەبەستی لە "کۆمەڵگای سیاسی" ئەو کەشوهەوایەیە کە تاکەکەسان
وەک هاووڵاتی و بەیەکەوە بەشداری دەکەن لە رێکخستنیدا. بەڕای
ئەرستۆ، جیاوازی لە نێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی سیاسیدا نییە،
هەروەک چۆن جیاوازی لە نێوان کاروباری تایبەتی و کاروباری
گشتیدا نییە. سیاسەت لێرەدا وەک گشتێک وایە کە هەموو لایەنەکانی
ژیان بەخۆوە دەگرێت. لە راستیدا، لە کۆمەڵگای ئەسینای سەدەی
پێنجەمی پێش زاییندا واقعی سیاسی (Political reality) لە چەمکی
واقعیی سیاسەت جیا نەبوو. "وتاری مردووەکان"ی پریکلس کە
تۆسیدیۆس لە بەشی یەکەمی کتێبی دووەمی شەڕی پلوپۆنزی خۆیدا
هێناویەتییەوە، بەرچاوترین نموونەی ئەم شتەیە. پریکلس لە بەشێکی
وتاری خۆیدا بە هاووڵاتیانی ئەسینایی دەڵێت: "لە راستیدا ئێمە تاکە
خەڵکێکین کە بڕوامان وایە ئەو کەسەی کە خۆی لە سیاسەت
هەڵنەقورتێنی، هاووڵاتییەکی بێ کەڵکە، نەک هاووڵاتییەکی ئارام و
گۆشەگیر. چونکە ئێمە هەموومان خۆمان لە کاروباری حکوومەتی



شار هەڵدەقورتێنین، جا چ لە رێی دەنگدانەوە بێت یان لە رێی
دەربڕینی پێشنیارەکانمان".

ئێستا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پەیوەندی نێوان چەمکی سیاسەت و
واقعی سیاسی لە چەرخی نوێدا، دەبینین واقعی سیاسی راستیی
چەمکی سیاسەت لە خۆیدا جێ ناکاتەوە و بەم شێوەیەش چەمکی
سیاسەت توانای وەرگرتنی بەرپرسیارێتی فیکریی ئەم واقعەی نییە.
بۆیە، سیاسەت رەنگدانەوەی کاروبارەکانی کۆمەڵگا نییە، بەڵکو وەک
دامەزراوێکی جیا لە پاڵ ئەودا دەوەستێت، یان وەک دێوێکی
ئەفسانەیی کۆمەڵگا هەڵدەلووشێت. هەرچۆنێک بێت هاووڵاتیان بکەر
(Subject)ی سیاسەت نین، بەڵکو بابەت (Object)ی سیاسەتن.
بەدەستەواژەیەکی دی، سیاسەتوانان و هاووڵاتیان تاکە واقعێکی
یەکگرتوو پێکناهێنن، بەڵکو بەدیهێنەری دوانەیەکن کە لە
جیاکردنەوەی رەهەندی سیاسەت و رەهەندی کۆمەڵگادا کورت
دەکرێتەوە. لە کۆتایی سەدەی هەژدە بە دواوە وێنەیەکی ئەم
جیاکردنەوەیە لە لێکجیاکردنەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا
بەرچاودەکەوێت. لێرەدا کێشەی ئازادیی تاکەکەسی لە شێوەی
سەربەخۆیی کۆمەڵگای مەدەنی لە بەرانبەر دەوڵەتدا دەخرێتەڕوو.
خەسڵەتی ئازادی لە دونیای نوێدا ماهیەتە تاکەکەسییەکەیەتی، لە
حاڵێکدا کە لە دونیای کۆندا ئازادی شتێکی کۆمەڵی و گشتییە. بەم
شێوەیە، ئامانجی سیاسەتی نوێ شتێک نییە جگە لە تێرکردنی
خواست و پێداویستییەکانی تاک لە کۆمەڵگای مەدەنیدا. لەبەرانبەر
ئەمەدا تاک لەرێی بەشداریکردنی ناراستەوخۆ و ماوەکورتی لە
سیاسەتدا، نێوانگیرێک بەناوی "دەوڵەت" لە نێوان خۆی و کۆمەڵگادا

دەستنیشان دەکات. لە ڕاستیدا، ئەو مەودایەی کە دامەزراوەی دەوڵەت لە دامەزراوەی کۆمەڵگا جیادەکاتەوە، دەستنیشانکەری ماهیەتی دەسەڵاتە. بۆیە کاتێک ئەم مەودایە دەگۆڕێت بۆ دابڕانێکی تەواو لە نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگادا و دەوڵەت وەک گشتێکی ئۆرگانیک هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگا (کایە ئابووری - قانوونیی و کولتوورییەکان) دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، لەم بارەدا دەسەڵات ماهیەتێکی تۆتالیتەرانەی دەبێت. دەسەڵاتی تۆتالیتەر ماهیەتێکی سەروو- کۆمەڵایەتیی هەیە. بەم واتایە، حزب و گرووپ یان تاکەکەسێک کە بەرجەستەبووی ئەم دەسەڵاتەیە، دەکەوێتە دەرەوەی کایەی کۆمەڵگاوە. هەرچەندە دەسەڵاتی تۆتالیتەر پەیوەندییەکی ئایدیۆلۆژی و ڕەمزیی بە کۆمەڵگاوە هەیە، واتە ماهیەتی بیروڕا و کردارەکانی خۆی لە ژیانی ڕۆژانەی تاکەکاندا دیاردەکات، بەڵام لە ڕوانگەی ئەم دەسەڵاتەوە تاکەکەسانی کۆمەڵگا مرۆڤی بێ دایک و باوکن، هەر بۆیە، تاک لە کۆمەڵگای تۆتالیتەردا پلەوپایەیەکی قانوونیی نییە. وەک دەبینین، ئەم جارەیان دەوڵەت نییە کە پێویستە خواست و پێداویستییەکانی تاکەکەسان جێبەجێ بکات، بەڵکو ئەوە تاکەکەسانن کە پێویستە پەیڕەوی لە شێوازە جیاجیاکانی زۆرداریێتی دەسەڵاتی تۆتالیتەر بکەن. بەم واتایەوە، ئەگەر سیاسەت لە کۆمەڵگای تۆتالیتەردا، گشت کۆمەڵگا دابگرێت، بەڵام- وێڕای وەک یەک لێکردنی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت (واتە کایەی تایبەتی و کایەی گشتی)- بە پێچەوانەی ئەو واقعەی کە لە چاخی کۆندا هەبوو، شتێکی کۆمەڵی و دەستەجەمعی نییە. کۆمەڵگای تۆتالیتەر، کۆمەڵگایەکی سیاسییە، چونکە سیاسەت تەوەری سەرەکی ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگایە. بەڵام



ئەم تاکانە نەک وەک هاووڵاتی، بەڵکو وەک تاکەکەسانی بچووک بە ترس و لەرزەوە لە کۆمەڵگای تۆتالیتەردا سیاسەت پەسند دەکەن. بەم شێوەیە بە ڕای ئەم تاکانە چەمکی تۆتالیتەریزم و چەمکی سیاسەت هەردووکیان تەعبیر لە واقعێک دەکەن. لەو ڕووەوە، ڕەتکردنەوەی واقعی سیاسیی تۆتالیتەریزم، ڕەتکردنەوەی چەمکی سیاسەتی لێدەکەوێتەوە. زۆرداریێتی سیاسەتی تۆتالیتەر و زاڵبوونی بێ قەید و شەرت بەسەر گشت بوارە کۆمەڵایەتییەکان، جارێکی دیکە دەمانخاتەوە بەردەم نموونەی "ئۆتۆنۆمیی سیاسەت"ی ماکیاڤیللی. بەڵام ئایا تا چەند ئەم ئۆتۆنۆمییە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دامەزراوەیەکی نوێی دەسەڵات- کە لە ژێر ناوی "دەوڵەت"دا سیاسەت لە ناوەڕۆکە گشتییەکەی دادەماڵێت و فۆرمێکی ستراتیژیی پێ دەبەخشێت- مەسەلەیەکە کە تەوەری سەرەکی بیری ماکیاڤیللی پێکدێنێت. هەوڵدانی ماکیاڤیللی بۆ پێناسەکردن و دیاریکردنی چەمکی نوێی سیاسەت لە چوارچێوەی جیهان و مرۆڤێکی نوێدا بەرچاو دەکەوێت. لە ڕاستیدا ماکیاڤیللی ڕووبەڕووی قەیرانێکی سیاسیی ئەوتۆ بۆتەوە کە ئەنجامی گۆڕانی سیستمی کۆزمۆلۆژیی (گەردوونناسیی) ئەرستۆیی و داڕشتنی بونیادی ئەنتۆلۆژی (بوونناسی)یکە کە لەماوەی نۆزدە سەدەدا بە دوای "ڕزگارکردنی دیاردە سرووشتییەکان"دا دەگەڕا. شتێکی سروشتییە کە مرۆڤ بە لەدەستدانی ناوەندێتی کۆزمۆلۆژییانەی خۆی، لەو شوێنەی کە ئەرستۆ لە سروشتدا بۆی دیارکردووە بەولاوەتر دەڕوات و بەم شێوەیە پێویستی بە تێڕوانینێکی سیاسیی نوێ هەبوو کە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێوەندییە نوێیەی کە لە نێوان ئەو و جیهاندا

هاتبووە کایەوە، پێوەندیی نێوان ئەو و هاوجۆرەکانی لە کۆمەڵگادا دیاریدەکات. مەبەستی ماکیاڤیللی لە پێناسەی نوێی چەمکی سیاسەت، بیرۆکەیەکە لەبارەی واقعێکی سیاسیی ئەوتۆ کە بەرای ئەو دەرکەوتەی سیستمی نوێی جیهانە. ماکیاڤیللی یەکەم بیریارە کە لە ڕێی دیاریکردنی چەمکی سیاسەت وەک کرداری ستراتیژیی دەسەڵات، ڕێگە بۆ تیۆری سیاسیی نوێ خۆش دەکات. ماکیاڤیللی هەوڵدەدات ئەو ناهاوسەنگییەی کە دوای داڕمانی مەعریفی لەگەڵ دونیای ئەرستۆیی لە جیهانی سیاسەتدا سەریهەڵدابوو، حاڵەتی هاوسەنگیی خۆی بۆ بگێڕێتەوە. لە ڕاستیدا شێوەی تەواوی ئەم هاوسەنگییە لە پێکهاتەی سیاسەتی عەقڵانیی هۆبزدا دەدۆزینەوە کە لەسەر بناغەی گۆڕانی سیاسەت بە شێوە ماکیاڤیللییەکەی دامەزراوە. وەک لیۆ شتراوس دەڵێت: "ماکیاڤیللی گرنگتر لە کریستۆف کۆلۆمبس، دۆزەرەوەی کیشوەرێکە کە هۆبز ئامۆژگارییەکانی خۆی لەسەر بنیات دەنێت". ئامانجی هۆبز بەزانستیکردنی سیاسەتە لەڕێی میتۆی بیرکارییانەی گالیلیێ کە دوایین چەسپاندنە فەلسەفییەکەی لە لای هیگڵ بەرچاو دەکەوێت. بەڵام، سیاسەتی زانستیی هۆبز هەلومەرجی بوونایەتیی خۆی لە ساتەوەختی ماکیاڤیللییانەی گەڕانەوە بۆ مەیدانی کاری سیاسیی خەڵک دەدۆزێتەوە. بۆیە، بیری سیاسیی ماکیاڤیللی بەدیهێنەری "مێژووگەرێتییەکی کردەییە" کە تێیدا چەمکی سیاسەت سەقامگیری بە واقعی سیاسی دەبەخشێت. لە ڕوانگەی ماکیاڤیللییەوە ئەم "مێژووگەرێتی کردەیی"یە دەربڕی ماهیەتی مێژوویی کردەوەی مرۆڤەکانە لە کۆمەڵگادا. بەڵام ئێستا ئاخۆ تاچەند پەسندکردنی ماهیەتی مێژوویی واقعێکی سیاسی، کاردەکاتە سەر



دیاریکردنی چەمکی نوێی سیاسەت، کێشەیەکە لە کتێبی میردا ڕووبەڕووی دەبینەوە. لێکۆڵینەوە لە کتێبی میر توانای ئەوەمان پێ دەبەخشێت کە چەمکی "سیاسەت" لە پەیوەندیی بەچەمکی "دەسەڵات"و "دەوڵەت"ەوە دەستنیشان بکەین. وەک گوتمان بە ڕای ماکیاڤیللی، سیاسەت، سیستمێکە بۆ پیادەکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت. لەم ڕوانگەوە، دەسەڵات، وەک بزوێنەری سەرەکی خستنەکار و چالاکیی دامەزراوەکانی دەوڵەت خۆی دەردەخات. بەواتایەکی دی، دەوڵەت تەنیا لە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە بوونی هەیە؛ دەسەڵاتی دەوڵەت تەنیا لە ڕێی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییەوە پیادە دەکرێت. کەواتە ماهیەتی دەسەڵاتی دەوڵەت هەر چییەک بێت، ئاشکرایە کە ناتوانین هیچ کۆمەڵگایەک بەبێ هێنانەدی ڕێکخستن، ڕێکبخەین؛ چونکە تەنانەت پڕ ئاژاوەترین کۆمەڵگای مرۆییش لەسەر جۆرە ڕێکخستن یان شیرازەیەک (Order) دامەزراوە. ئەگەر ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی نەبێت، ژیانی کۆمەڵایەتیش نابێت. دەتوانین بڵێین ڕێکخستن یان شیرازە، هۆکاری یەکپارچەیی کۆمەڵگای سیاسییە. کەواتە، هەر دەسەڵاتێک بۆ ئەوەی دەسەڵات بێت، پێویستی بە ڕێکخستن هەیە، هەر دەسەڵاتێک ڕێکخستنێکی تایبەت بەخۆی دێنێتە ئاراوە. لە دیموکراسیدا، ڕێکخستنی قانوونەکان زاڵە، لە کاتێکدا کە حکوومەتە چەوسێنەر و زۆردارەکان، بەهێزی چەک و لە ڕێی کاری توندوتیژەوە سیستەم دەهێننەکایەوە. لەم دوو جۆرە حکوومەتەدا، ڕێکخستن هەیە، بەڵام یەکێکیان، لە ڕێی ڕێزگرتنی هاووڵاتیان لە قانوون و لەوی دیکەدا، بەهۆی ترساندن و تۆقاندنی هاووڵاتیان لە دەسەڵاتی دەوڵەتەوە. شلەژاویی هەر سیستەمێک تەنیا لە ڕێی کار و

ئەرکەکانیەوە ناتوانرێت دیاربکرێت بەڵکو پەیوەندی بە پاراستنی ئەو سیستەمەشەوە هەیە. لەو رووەوە، سەقامگیریی سیاسی، زێتر ئەنجامی بەردەوامبوونی سیستەمە.

لەو بارەیەوە رێنماییەکانی ماکیاڤیللی، تێروتەسەل و دروست دێنە بەرچاو. دەتوانین کتێبی **گوتارەکان** بە کتێبێک لەقەڵەم بدەین کە نووسەر تێیدا هەوڵدەدات رێکخستنی کۆمار شەنوکەو بکات. لە کۆماردا، رێکخستن، تەریبە لەگەڵ خواستی ئازادی. بە بڕوای ماکیاڤیللی، کۆمار رژێمێکە کە تێیدا، رێکخستن، بە باشترین شێوە دێتە ئاراوە، چونکە لە راستیدا، رێکخستن، بۆیە دێتە ئاراوە تا "کاروباری گشتی" جێبەجێبکات. هەر لەبەر ئەوە، ماکیاڤیللی جەخت لەسەر مەترسیی ئەو گەندەڵییە دەکات کە رووبەڕووی هەر کۆمارێک دەبێتەوە. مۆنتسکیۆش لە بەشی سێیەمی کتێبی سێیەمی **گیانی قانوونەکان**دا، درێژە بەم باسە دەدات. گەندەڵی، سوود وەرگرتنی هەڵە و نادروستە لە دەسەڵات. بە گوتەیەکی دی، خاوەن دەسەڵاتەکان، رێگە بە خۆیان دەدەن بۆ رازیکردنی خواستەکانیان، قانوون بشکێنن. بەڵام هیچ کۆمارێک بەرچاو ناکەوێت کە لەسەر قانوونشکێنی بەردەوام بێت. کۆماری بەبێ قانوون مەترسیی لەناوچوون یان گۆڕانی بۆ حکوومەتێکی چەوسێنەر و ستەمکار هەڕەشەی لێدەکات. ژیانی سیاسی لە هەر کۆمارێکدا بەپێی بڕیارەکانی قانوون و بەپێی ئەو رێسایانەی کە بۆ چالاکیی هەر کۆمەڵگایەک دانراون، بەردەوام دەبێت. لە کۆماری رۆمادا، ئەوەی سەرنجی ماکیاڤیللی بۆ خۆی رادەکێشێ، ئەو هەوڵەیە کە بۆ رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەنجام دەدرا. بەڵام وەک پێشتر



گوتمان، ماکیاڤیللی باس لە مەسەلەی راستەقینەیی بوونی دیموکراسیی رۆما ناکات. ئەو تەنیا بەوە وازدێنێت کە کار و چالاکییەکانی دامەزراوەکانی رۆما لە هەموو لایەنە سیاسی و سەربازییەکانیانەوە شیبکاتەوە. بەرای ماکیاڤیللی، تا ئەو کاتەی بتوانین رۆما بە نموونەیەکی پوختی رێکخستن و هەماهەنگیی سیاسی و سەربازی لەقەڵەم بدەین، گرنگ ئەوە نییە کە داخۆ ئەو شارە دیموکرات بووە یان کۆمارێکی ئۆلیگارشی. کەواتە نابێ ماکیاڤیللی، بە بیریارێکی ئەوتۆ لەقەڵەم بدەین کە تەنیا بیر لە دیموکراسی دەکاتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە بیرکردنەوەکانی زێتر تایبەتن بە هونەری سیاسەت، نەک بە لێکۆڵینەوەی تیۆرێکی سیاسیی تایبەت. هەر بۆیە هێنانەدی کۆماری بە پێشکەوتنی بەهاگەلێکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیی دیاریکراو لەقەڵەم دەدات. دابڕانی پەیوەندیی ئەو بە رێڕەوە سیاسییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، دوای دیراسەکردنی مێژووی سەردەمی کۆن دەردەکەوێت. بە بڕوای ماکیاڤیللی، یەکگرتوویی، بەردەوامی و گەشانەوەی کۆمار بەهۆی شێوەی کاری سیاسیی دامەزراوەکانییەتی؛ هەروەها هەموو هەوڵە سیاسییەکانی ئەوەیە کە ئەم ئەنجامانە لە دامەزراوەکانی کۆماری فلۆڕەنسای سەردەمی خۆیدا وەدەست بێنێت. ئەو بەراوردکردنەی کە لە نێوان کۆماری رۆما و کۆماری فلۆڕەنسادا دەیکات هەر لەم چوارچێوەیەدا مانای خۆی وەردەگرێت. ئەو نایەوێت لە نێوان گیانی مەدەنی کۆمەڵگا کۆنەکان و دامەزراوە نوێیەکان، هەماهەنگییەک دروست بکات، بەڵکو هەوڵدەدات پەی بە واتا و ماهیەتی هاوسەنگی ببات کە لە نێوان ئەم دووەدا لە دونیای یۆنانی - رۆمانیدا هەبووە و بۆ ئەوەی لە فلۆڕەنسای





سەردەمی خۆیدا بەرجەستەی بکات. ماکیاڤیللی، بۆ ئەنجامدانی ئەم مەبەستە، شێوەی بیرکردنەوەی سیاسیی نەریتی سەرەوژێر دەکات بۆ ئەوەی بنەماکانی سەربەخۆیی سیاسیی فلۆرەنسا دابرێژێت. بە رای ماکیاڤیللی، تاکە ئامانجی سیاسەت، دارشتنی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان نییە، بەڵکو بایەخ بە ڕێکخستنی هۆکارەکانی بنیاتنانی ژیانی دەوڵەتیش دەدات. بە بڕوای ئەو، چالاکیی سیاسی، بریتییە لە ڕێکخستنی بونیادی کۆمەڵگا لە ڕێی بەڕێوەبردنی حکوومەتەوە. بیرۆکەی جیاکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لە دەوڵەت، هەر لێرەوە سەرهەڵدەدات. لە تیۆرە سیاسییەکانی ماکیاڤیللیدا، ئەم بیرۆکەیە سەرەتا لە شێوەی جیاکردنەوی دەسەڵاتی میر (یان دەسەڵاتی کۆمار) لە خەڵک دەردەکەوێت. هەر لەبەر ئەوە، لە بەرهەمەکانی ماکیاڤیللیدا هیچ ئاماژەیەک بۆ لەناوچوونی بونیادی کۆمەڵگا لە ژێر باڵادەستیی "دەوڵەتێکی ئامادە لە هەموو شوێنێک و چاودێر بەسەر هەموو شتێکەوە" نادۆزینەوە. ماکیاڤیللی پێی وانییە کە دەوڵەت بریتی بێت لەو دەسەڵاتەی کە گشت کۆمەڵگای مەدەنی لە ناوخۆیدا تواندبێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بەردەوام لە هەڵسوکەوتی دەسەڵاتی دەوڵەت لەگەڵ خەڵکدا، ئاگاداریان دەکاتەوە. بە دەستەواژەیەکی دی، بە بۆچوونی ئەو، "بواری سیاسەت" بوارێکی بێ سنوور نییە کە دەسەڵات هەوڵبدات بەسەریدا زاڵ بێت. هەر لەبەر ئەوەیەکە، ماکیاڤیللی، هەموو جۆرە وێنەیەکی "گشتێتی ئۆرگانی"ی دەوڵەت رەت دەکاتەوە. لە تیۆرەکانیدا، کایەی سیاسەت، کەشوهەوایەکە ماهیەتەکەی یارمەتیدەرە بۆ هاتنەکایەی گۆڕانکاریی هەمیشەیی. ماکیاڤیللی بە دووبارە بیرکردنەوە لە سیاسەت، گشت چوارچێوەیەکی

تیۆری کە بڕوایان بە بەردەوامیی ژیانی دامەزراوە تێکدەرەکانی ڕێکخستنی سیاسی هەیە، دەخاتە ژێر پرسیارەوە. کەواتە، بە بڕوای ئەو "دەشێ گومانێک دزە بکاتە ناو هەموو بونیادە یەکگرتووخوازەکانەوە"٧٨. ئەم بۆچوونە یەقینە خۆی لە خۆیدا بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی پلەوپایەی ماکیاڤیللی لە نێو بیریارە سیاسییە گەورەکاندا بەتایبەت کە بیروڕاکان –هیچ کات خۆبەخۆ، هزر سەرگەرم ناکەن، بەڵکو ئەو تەنیا ئەو کاتە دەپرژێتە سەریان کە لە کردەدا بەرجەستە دەبن، هەروەها هەر لە کردەشدایە کە ژیانی راستەقینەیان لە لای ئێمە ئاشکرا دەبێت. بەو پێیە، ماکیاڤیللی، لە مێژووی هزرە سیاسییەکاندا، پێگەیەکی تایبەتی هەیە. بیرکردنەوەی ماکیاڤیللی، نە ڕێککەوتنخوازانەیە و نە شۆڕشگێڕانەیە؛ هەروەها موخاتەبە تایبەتەکانی، نەدیکتاتۆرەکانن و نە شۆڕشگێڕەکان. ئەو بۆ هەموو ئەو کەسانە دەدوێت کە کەم تا زۆر سیاسەت دەکەن، یان لە ڕێی سیاسەتەوە دەژین. هەر لەبەر ئەوە، لێکۆڵینەوە لە بیروڕا سیاسییەکانی ماکیاڤیللی، وەک پێوەرێک بۆ تێگەیشتن لە چارەنووسی سیاسیی تاکەکەسان پێویستە. لەم ڕووەوە ژیانی شوێنکەوتووانی ماکیاڤیللی تازە دەستی پێکردووە.



**پەراوێزەکان:**

تێبینی: لە پەراوێزەکاندا، ژمارەی یەکەمی ناوکەوانە کە ژمارەی زنجیرەی کتێبەکەیە لە بیبلۆگرافیای کۆتاییدا و ژمارەی دووەمیش ژمارەی لاپەڕەیە.

[1] نیکولا ماکیاولی، **شهریار**، ترجمه‌ء داریوش آشوری، تهران، نشر پرواز، ١٣٦٦، ص٤٦.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٥٤٦)

[4] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٦٥٠)

[5] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٣٨٠)

[6] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٦٤٨)

[7] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٥٩٨)

[8] **میر**، وەرگێڕانی داریوش ئاشووری، ل١١٣.

[9] جان جاک ڕۆسۆ، **پەیمانی کۆمەڵایەتی** (٦٢؛ ل٢٨٩)

[10] سپینۆزا، **نامەی سیاسەت** (٦٣؛ ل٣٩)

[11] کلود لوفۆر، **ماکیاڤیللی** (٢٣؛ ل٧٨)

[12] **میر**، وەرگێڕانی داریوش ئاشووری، ل٨٦.

[13] هیگل، **وانەکانی فەلسەفەی مێژوو** (٤٩؛ ل٣١٤)

[14] ڕژین پێرنۆ، **بۆ کۆتاییهێنان بەسەدەکانی ناوەڕاست** (٥٩؛ ل١٦).

[15] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٣٨٦)

[16] ئۆگۆستین ڕونۆدێ، **ماکیاڤیللی** (٢٧؛ ل١٤٥)

[17] کلۆد لوفۆر، **پێشەکییەک بۆ گوتارەکان** (٢٣؛ ل١٣)

[18] ماکیاڤیللی، **میر**، وەرگێڕانی ئاشووری، ل٦٢.

[19] ماکیاڤیللی، گوتارەکان (١؛ ل٦٢٧)

[20] **میر**، وەرگێڕانی ئاشووری، ل٤٦.

[21] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٤١٤)

[22] هەمان سەرچاوە، ل٤٧٨.

[23] هەمان سەرچاوە، ل٤١٣.

[24] هەمان سەرچاوە، ل٤٨٨-٤٨٩.

[25] **میر**، وەرگێڕانی داریوش ئاشووری، ل٧٦.

[26] نامەی ڕێککەوتی ١٨ی ئازاری ١٥١٣ ماکیاڤیللی بۆ فرانچیسکۆ ڤیتۆری، لە **نامەکانی ماکیاڤیللی** (١١؛ ل٣٣٢)

[27] نامەی ڕێککەوتی ١٠ی ئەیلوولی ١٥١٣ بۆ فرانچیسکۆ ڤیتۆری، **نامەکانی ماکیاڤیللی** (١١؛ ل٣٧٠)

[28] هەمان سەرچاوە، ل٣٦٩-٣٧٠.

[29] ئەنتۆنیۆ گرامشی، **تێبینییەک لەمەڕ ماکیاڤیللی و میری نوێ** (٢٠؛ ل٤١٥)

[30] مارسیل گەوشێ، **لە ئەفسانە داماڵینی جیهان** (٤٧؛ ل٣٥)

[31] **میر**، وەرگێڕانی داریوش ئاشووری، ل٥٩.

[32] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

[33] هەمان سەرچاوە، ل٦٠.

[34] هەمان سەرچاوە، ل٦١.

[35] هەمان سەرچاوە، ل٦٠.

[36] هەمان سەرچاوە، ل٦٢.



[37] هەمان سەرچاوە، ل٦٨.

[38] هەمان سەرچاوە، ل٨٣.

[39] هەمان سەرچاوە، ل٨٥.

[40] هەمان سەرچاوە، ل ٨٦.

[41] مۆریس میرلۆپۆنتی، **لە ستایشکردنی فەلسەفەدا** (٢٥؛ ل٣٦٠)

[42] **میر**، وەرگێڕانی داریوش ئاشووری؛ ل٨٧-٨٨.

[43] ئەلبێرتۆ مۆراڤیا، **مرۆڤ** (٥٦؛ ل١٧٦)

[44] ئۆگۆستین رونۆدێ، **ماکیاڤیللی** (٢٧، ل١٤و١٥)

[45] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٤٠٧)

[46] هەمان سەرچاوە، ل٥١٤.

[47] هەمان سەرچاوە، ل٣١٤.

[48] نامەی ڕێککەوتی ٣٠ی ئەیلوولی ١٤٩٩ی ماکیاڤیللی، لە **نامەکانی ماکیاڤیللی** (١١؛ ل...)

[49] میکاڤیللی، "دەیەکان"، لە **کۆبەرهەمەکان** (١؛ ل٢٩١)

[50] **میر**، وەرگێڕانی داریوش ئاشووری، ل٣٠.

[51] هەمان سەرچاوە، ل٤٢.

[52] لیۆشتراوس، **چەند بیروڕایەک لە بارەی ماکیاڤیللییەوە** (٣٠؛ ل٤٨)

[53] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٣٧٦)

[54] لیۆشتراوس، **چەند بیروڕایەک لە بارەی ماکیاڤیللییەوە** (٣٠؛ ل١١٩-١٢٠)

[55] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٦٨٩)

[56] ئایزایا بەرلین، "نوێکاریی ماکیاڤیللی" لە **پێچەوانەی ڕەوت** (١٦؛ ل٤٨).

[57] لیۆشتراوس، **چەند بیروڕایەک لە بارەی ماکیاڤیلییەوە** (٣٠؛ ل٢٢٨)

[58] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٤١٣)

[59] هەمان سەرچاوە، ل٤١٥.

[60] هەمان سەرچاوە، ل٤٠٥.

[61] میشێل میسلن، **مرۆڤی رۆمانی** (٥٤؛ ل٢١٢)

[62] هەمان سەرچاوە، ل٢١٦.

[63] ماکیاڤیللی، **گوتارەکان** (١؛ ل٤٤٩)

[64] هەمان سەرچاوە، ل٥٠٥.

[65] هەمان سەرچاوە، ل١٩٣.

[66] هەمان سەرچاوە، ل ٤٠٠.

[67] هەمان سەرچاوە، ل٣٩٩.

[68] هەمان سەرچاوە، ل٣٩٢.

[69] هەمان سەرچاوە، ل٤٣٠.

[70] هەمان سەرچاوە، ل٤٣١.

[71] هەمان سەرچاوە، ل٦٤٠.

[72] هەمان سەرچاوە، ل٥١٧.

[73] مومیس فینلی، **داهێنانی سیاسەت** (٤٥؛ ل١٨٣-١٨٤)

[74] لیۆشتراوس، **چەند بیروڕایەک لە بارەی ماکیاڤیللییەوە** (٣٠؛ ل١١٨).

# بیلۆگرافیا

## ئەلف: بەرهەمەکانی ماکیاڤیللی

1. *Oeuvres Complètes,* Bibliothèque de la Pléïade, Paris, Gallimard 1952.

2. *Le Prince,* traduction de Jean Anglade + une préface de Raymond Aron, Le livre de Poche, Paris, Librairie Générale Francaise 1972.

3. *Le Prince,* une préface de Paul Veyne, Collection Folio, Paris, Gallimard 1980.

4. *The Prince,* edited by H.Butterfield, Everyman's Librairy 1958.

5. *Discours sur la Première Décade de Tite-Live,* traduction de Toussaint Guiraudet + une préface de Claude Lefort, collection Stratégies, Paris, Berger-Levrault 1980.

6. *The Discourses,* edited by Bernard Crick, Penguin Books 1970.

7. *L'Art de la Guerre,* traduction de Toussaint Guiraudet + une préface de George Buis, collection Stratégies, Paris, Berger-Levrault 1980.

8. *Machiavelli: the chief works and others.* Durham North Carolina, 3 volumes, 1965.

9. *The Litterary works of Niccolo Machiavelli,* Oxford 1960.

10. *History of Florence,* Harper Torchback, New York 1960.

11. *Toutes les lettres de Machiavel,*2 Tomes - Paris, Gallimard 1955.

## ب: لە بارەی ماکیاڤیللییەوە

12. R. Aron: Machiavel et Marx: in *Etudes Politiques,* Paris, Gallimard 1972.

13. A.F. Artaud : *Machiavel (son génie et ses erreurs),* 2 tomes, Paris,



Didot fréres 1933.

14. E. Barincou: *Machiavel par lui-même,* Paris, Seuil 1969.

15. Charles Benoist: *le Machiavelisme,* 3 volumes, Paris, Plon 1915.

16. Isaiah Berlin: The Originality of Machiavelli, in *Against the Current,* Oxford 1981.

17. B. Croce: "Machiavel et Vico" in *La Philosphie comme Histoire de la Liberté,* Paris, Seuil 1983.

18. J.G. Fichte: Sur Machiavel Ecrivain et sur des passages de ses oeuvres, in *Machiavel et autres écrits philosophiques et politiques de 1806/1807* Paris, Payot 1981.

19. Félix Gilbert: Machiavel: la renaissance de l'art de la guerre, *in Les maîtres de la stratégie,* tome 1 , édité par Edward Mead Earle, collection Stratégies, Berger-Levrault 1980.

20. A. Gramsci: Notes sur Machiavel, sur la politique et sur le Prince Moderne in *Gramsci dans le Texte,* Paris, Editions Sociales 1975.

21.B. Guillemain: *Machiavel (l'anthropologie politique),* Genéve, Droz 1977.

22. J.R. Hale: *Machiavelli and Renaissance Italy,* Penguin Books 1961.

23. Claude Lefort: *Le Travail de l'Oeuvre, Machiavel,* Paris, Gallimard 1972.

24. F. Meineke: *Machiavellism,* London, Routledge and Keagan Paul 1962.

25. M. Merleau-Ponty: Note sur Machiavel, in *Eloge de la Philosophie,* Paris, Gallimard 1953.

26. D.G. Mounin: *Machiavel,* Paris, Seuil 1958.

27. O.A. Renaudet: *Machiavel,* Paris, Gallimard 1942.

28. O.R. Ridolfi: *The life of Niccolo Machiavelli,* RoutLedge 1963.

29. Claude Rousseau: La Doctrine de la Guerre de Machiavel, in *Annales de Philosophie Politique,* Paris, P.u.F. 1970.

30. Leo Strauss: *Pensées sur Machiavel,* Paris, Payot 1982.

31. Hélène Vedrine: *Machiavel ou la Science du Pouvoir,* Paris, Seghers 1972.

32. Eric Weil: Machiavel Aujourd'hui, in *Essais et Conférences,* tome 2, Paris, Plon 1971.

33. H.H. Whitfield: *Discourses on Machiavelli,* Cambridge University Press 1969.

ج: سەرچاوەی دیکە:

34. R.H. Barrow: *Les Romains,* Paris, Payot 1962.

35. P. Birnbaum: *La fin du politique,* Paris, Seuil, 1975.

36. J. Burckhardt: *La Civilisation de la Renaissance en Italie,* Paris, 1958.

37. E. Cassirer: *The Myth of State,* Oxford University Press 1946.

38. E. Cassirer: The Individual and the Cosmos, in *the Renaissance Philosophy,* Harper and Row Publishers, 1963.

39. Ciceron: *De la République,* Paris, Flammarion 1965.

40. Cicéron: *Des lois,* Paris, Flammarion 1965.

41. J. Delumeau: *La Civilisation de la Renaissance,* Paris 1967.

42. J. Ellul: *L'Illusion Politique,* Paris, Laffont 1965.

43. M.I. Finley: *Studies in Ancient History,* Routledge and Keagan Paul 1974.

44. M.I. Finley: *Aspects of Antiquity,* Penguin Books 1977.

45. M.I. Finley: *L'Invention de la Politique,* Paris, Flammarion 1985.

46. M.I. Finley: *Démocratie Antique et Démocratie Moderne,* Paris, Payot 1976.

47. M. Gauchet: *Le Désenchantement du Monde,* Paris, Gallimard 1985.

48. B. de Jouvenel: *De la Politique Pure,* Paris, Calman-Levy 1977.

49. Hegel, *Leçons sur la Philosophie de L'histoire,* Paris Vrin, 1979, p314.



50. A Koyré: *Du Monde clos à l´Univrs Infini,* Paris, Idées, Gallimard 1962.

51. G.de Lagarde: *La Naissance de l'Esprit laïque au déclin du Moyen-Age,* Louvain 1956.

52. J.W. Lapierre: *Le Pouvoir Politique,* Paris, P.U.F. 1969.

53. Pierre Manent: *Naissance de la Politique Moderne,* Paris, Payot 1977.

54. Michel Meslin: *L´Homme Romain,* Paris Hachette 1978.

55. P.Mesnard: *L'Essor de la Philosophie Politique au 16ème siècle,* Paris 1969.

56. Alberto Moravia : *L'Homme,* Paris, Flammarion, 1965, p.176.

57. Claude Nicolet: *Le Métier du Citoyen dans la Rome républicaine,* Paris, Gallimard 1976.

58. O.A. Passerin d'Entrevès : *La Notion de l'Etat,* Paris, Sirey 1969.

59. R.Pernoud: *Pour en finir avec le Moyen-Age,* Paris, Point Seuil 1977.

60. Polybe: *Histoires,* 9 volumes, Paris, Les Belles Lettres, 1969.

61. N.Rouland: *Rome, Démocratie impossible,* Paris Actes Sud, 1981.

62. J.J. Rousseau, *Le Contrat Sociale,* III, 6, Paris. Montaigne, 285.

63. B. Spinoza: Traité Politique, I, 7, *Ouevres Complete,* Paris, Garnier-Flamarion, 1966, p 39.

64. Leo Strauss: *Droit Naturel et Histoire,* Paris, Plon 1954.

65. Tite-Live: *Histoire Romaine,* 33 tomes, Paris, Les Belles Lettres 1965.

66. Thucydide: *La Guerre de la Peloponèse,* Gallimard Paris, 1964, P.189-190.

67. H. Vedrine: *Les Philosophies de la Renaissance,* Paris, Que sais-je ? 1971.

## کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی لە ساڵی ٢٠٠٦

- دەروازەکانی کۆمەڵناسی (چاپی دووەم) • مەنوچێهر موحسنی/ کۆمەڵێک وەرگێڕ
- مێژووگەرێتیی هزری عەرەبیی ئیسلامی • محەمەد ئارکۆن/ نەریمان تالیب
- گوڵبژێرێک لە چیرۆکەکانی • سادقی هیدایەت/ عەلی انەوازادە
- چەند وێستگەیەکی ئەدەبی و فیکری • ئازاد بەرزنجی
- خواوەند و پاڵەوانەکانی گریکلان د • ئیریک ئیریکسۆن/ تەها ئەمین هەڵەدنی
- حەکیمانە • پاولۆ کۆیلیۆ/ یوسف محەمەد و کارا فاتیح
- یەکەمین سەرچاوەکانی هونەری مۆدێرن • هـ. و. جەنسن/ سەیوان سەعیدیان
- چەند دۆکیۆمێنتێکی نێودەوڵەتی لەبارەی مافەکانی مرۆڤەوە • قادر وریا
- دیجلەی هزرم • د. مارف خەزنەدار
- ئایین و دەوڵەت و پیادەکردنی شەریعەت • د. محەمەد عابد جابری/ فوئاد سدیق
- فەلسەفەی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی ئوگوستین • د. عەلی زەیعور/ سنوور عەبدوڵلا
- گۆرستانی غەریبان • ئیبراهیمی یونسی/ غەریب پشدەری
- فیهی ما فیهی • مەولەوی/ عەلی نانەوازادە
- گوڵستان • سەعدی/ عەلی نانەوازادە
- ئایدیای قانوون • دنیس لوید/ ئاسۆ کەریم و ئەوانی تر
- مرۆڤ و ئایینەکان • میشێل مالرۆب/ هیوا مەلا عەلی سوورەدێیی
- پەروەردە و پێگەیاندنی منداڵ • ئا. مکارنکۆ/ مستەفا غەفور
- القبائل الكورديه • ويليام ايغلتون/ د. احمد محمود خليل
- گەڕیان ل دیف بەختەوەریێ • لورد ئاوویبێوری/ جگەرسۆز پێندرۆیی
- تەنگژەکانی تیرۆریزم • کۆمەڵێک نووسەر/ هێمن غەنی و مەروان کاکل
- دوا وەسوەسەی کریست • کازانتزاکی/ کەریم دەشتی
- گوتاری تیرۆریزم • کۆمەڵێک نووسەر / کۆمەڵێک وەرگێڕ
- ژان • مارگارێت دوراس/ رەسوڵ سوڵتانی
- تیرۆریزم وەک تاوانێکی ڕێکخراو • گاری پوتەر و مایکڵ لیمەن/ ئەبوبەکر مەجیدی
- چەند لایەنێکی واتاسازی • کوروش سەفەوی/ دلێر سادق کانەبی
- هەموو هەقیانە • مەنۆچەهری کەریم زادە/ غەریب پشدەری



- کاتێ نیچە گریا • ئیرڤین دی یالوم/ دڵشاد هیوا
- ژانی ژینگە • سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر
- عاشقانە • پاولۆ کۆیلیۆ/ یوسف محمد و کارا فاتیح
- کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی (بەرگی یەکەم) • کارل پوپەر/ ئیدریس شێخ شەرەفی
- کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی (بەرگی دووەم) • کارل پوپەر/ ئیدریس شێخ شەرەفی
- میسیۆ برایم و گوڵەکانی ناو قورعانەکەی • ئیریک ئیمانوئیل شمیت/ سەلاح گادانی
- خطوه على الطريق الى البيت الكوردي الكبير • د. حسين بديوى
- اليه العلاقه بين المعارضه والسلطه فى الاسلام • د. كاوه محمود شاكر
- جماليات الطبيعه فى كردستان العراق • د. محمد عارف
- کورد و جینۆساید و ئیبادەکردن • هەژار عزیز سورمێ
- پرۆدۆن • جۆرج گورڤیچ/ ئارام ئەمین
- مینۆرسکی و کورد (چاپی دووەم) • ئەنوەری سوڵتانی
- کورد و سەلجوقییەکان • د. نیشتمان بەشیر/ ئیدریس عەبدوڵلا
- دەرۆمانی گەورەی جیهان • سۆمرت مۆم/ ئەسکەندەر مەحمود
- لە دەوڵەتی دەسەڵاتەوە تا دەوڵەتی عەقڵ • کەمال پۆلادی/ سیروان زەندی
- ئیبن خەلدون وکۆمەڵناسیی نوێ • فوئاد بەعلی/ زیرەک احمد و سنوور عەبدوڵلا
- ئەو ئایدیایانەی دەستیان بەسەر جیهاندا گرت • مایکل ماندلبۆم/ گۆران سەباح غەفوور
- کورد لە ئەرشیفی روسیا و سۆڤیەتدا • د. ئەفراسیاو هەورامی
- قوتابخانە ئەدەبییەکان • رەزا سەید حسەینی/ حەمەکەریم عارف
- عاریفانە • پاولۆ کۆیلۆ/ یوسف محەمەد وکارا فاتح
- زمان، هزر و کولتور • چەند نووسەرێک/ رەحیم سورخی
- توێژینەوەی تیۆریی ئەدەبی • راجێر وێبستەر/ عەبدولخالق یەعقوبی
- ماکیاڤیللی و بیری ڕێنسانس (چاپ دووەم) • رامین جەهانبەگلو/ موسلح ئیروانی
- ڕاپەڕینی کوردان (چاپی دووەم) • پ. م. ا. حەسرەتیان/ جەلال دەباغ
- جێگای بەتاڵی سلووچ • مەحمود دەوڵەت ئابادی
- سەرکەوتنی بێ سنوور بە ٢٠ رۆژ • ئانتونی رابینز/ هاموون
- واتاسازی • کلۆد جێرمان و هی تر/ د. یوسف شەریف
- سنووری کوردستان (چاپی دووەم) • د. عبدالله غەفور